



# ژیانی ئیمامی مالیک

نوسینی: محمد ئەبو زەهرە
وەرگێڕانی: سوهام بەرزنجی









**ژیانی ئیمامی مالیك**

نووسینی: محمد ئەبوزەهرە

وەرگێڕانی: سوهام بەرزنجی

هەڵەچنی: میران ئەحمەد

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠٢٠

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: ٣٠٠٠دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان، ژمارە سپاردنی (١٢٢٠)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە..

کتێبخانەی گەشە بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە





سلێمانی – بازاڕی ئاوباریك بەرامبەر کاسۆ مۆڵ – دوکانی ٧١

٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣ – ٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦




## پێشەکی

لەکتێبی (ترتیب المدارك)ی قازی عەیازدا هاتووە: "لەیسی کوڕی سەعد دەڵێت: لەشاری مەدینە گەیشتم بەمالیك پێم وت: دەبینم عارەق لەنێو چاوانت دەسڕیت!! وتی: لەگەڵ ئەبوحەنیفەدا ئاوا عارەقم کرد، فەقیهە بەڕاستی ئەی میسری. پاشان گەیشتم بە ئەبوحەنیفە و پێم وت: ئەو پیاوە چەند جوان تۆی قبوڵ بووە، ئەبوحەنیفە وتی: کەسم نەبینیوە وەك ئەو خێرا وەڵامی ڕاستگۆیانە بداتەوە و ڕەخنەی تەواو بگرێت."

ئەمە بۆچوونی ئیمام ئەبوحەنیفەیە بەرانبەر ئیمامی (دار الهجرة)، ئەوەش بۆچوونی ئیمامی حیجازە بەرانبەر فەقیهەکەی عێراق، هەردووکیان پێگەی فیقهی و شارەزایی ئەویتریانی لەبەرچاوە و بەویژدانەوە باسی دەکات.

بەم ئاڕاستە دروستە هەوڵدەدەین لەبارەی ژیانی ئیمامی مالیکەوە بنووسین، دوور لەهەر دەمارگیری و لایەنگیرییەك بۆی، بەدەر لەهەر دژبوونێك لەگەڵی، ڕێگای ئەوانە ناگرینە بەر کەلەپاش سەردەمی ئیجتیهاد هاتن، چونکە ئێمە پێمان وانییە کەفەزڵی ئیمامێك لەناتەواوی ئیمامێکی ترەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەڵکو فەزڵەکەی لەتواناو لێهاتوویی و خوێندن و شەونخونی و دڵسۆزییەوە لەداواکردنی عیلمدا و ئیجتیهادەکانی بۆ گەیشتن پێی

سەرچاوەیگرتووە، هەریەکەشیان بەشی خۆیان هەیە لەم بوارەدا. ئەوان (خوا لێیان ڕازی بێت) بەهۆی سووربوونیانەوە لەسەر وەرگرتنی عیلم و نییەتباشیان لەمەدا، لەبۆچوونی خۆیان پاشگەز دەبوونەوە ئەگەر بیانبینیایە حەق لەلای بەرامبەرەکانیانە.

مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) هەردەم دەیوت: "دەکرێت قازی هەرگیز لەمەجلیسی زانایان دوور نەبێت، ئەگەر شتێکی هاتە پێش بیگێڕێتەوە بۆ ئەوان و پرس و ڕاوێژیان پێ بکات."

لەمبارەیەشەوە ئامۆژگاری والییەکی شاری مەدینەی کردووە و پێی وتووە: "ئەگەر کارێکت هاتە پێش و لەبارەیەوە شارەزا نەبوویت، ئەوا بۆچوونی خەڵکی تر لەوبارەوە بکەرە پێوەر، چونکە ئەوە عەیبەی بۆچوونەکەی ناهێڵێت، هەروەك چۆن ئاگر عەیبی ئاڵتون لادەبات."

ئەبو یوسف لەبابەتی (أحباس)دا هاوڕای ئەبوحەنیفە بوو، لەهەندێك بابەتیشدا بۆچوونی لەگەڵ ئیمامی مالیکدا یەکینەدەگرتەوە، کاتێ گەیشتە خزمەتی ئیمامی مالیك لەبارەی ئەوەی خەڵکی مەدینە لەسەری دەڕۆن ئاگاداریکرد، هاتە سەر بۆچوونەکەی ئیمامی مالیك و وتی: "ئەگەر مامۆستاکەم (مەبەستی ئەبوحەنیفەیە)، ئەوە ببینێت کەمن بینیم ئەوا ئەویش

لەبۆچوونەکەی خۆی پاشگەز دەبوویەوە، هەروەك چۆن من لێی پاشگەز بوومەوە."

ئەگەر بمانەوێت دوور لەهەر دەمارگیری و لایەنگرییەك سەبارەت بەژیانی ئیمامی (دار الهجرە) بنووسین، پێویست دەکات بۆچوونی ئەوکەسانەی دەمارگیرن وەلاوە بنێین، مەگەر شتێك کە لایەنێك لەلایەنە فیکریەکانی ئیمامی مالیك بخاتە ڕوو وەربگرین، ئەمەش بەو مانایە نییە ئێمە واز لەبۆچوونەکانیان بهێنین، نا بەڵکو هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکەین، ئەوەی لەگەڵ توێژینەوەکەماندا یەکیگرتەوە وەردەگرین، ئەوەشی زیادەڕەوی تێدا بوو وەلا دەنێین، بەمەش حەق لەهەر زیادەپێداوتن و دەمارگیرییەك دەرباز دەکەین، هەروەك چۆن زێڕ لەهەر خەوشێك خاوێن دەکرێتەوە .

لەم پێناوەشدا هەندێ وتە دەهێنینەوە و هەندێکیش فەرامۆش دەکەین، ئەم کارە زۆر پێویستە، چونکە پیاهەڵدانە دەمارگیرییەکان هێندە زیادەڕەوییان تێدایە کەعەقڵ قبوڵی ناکات، لەپایەی کەسانی بەرانبەریش کەمدەکەنەوە، ئەگەرهاتوو ژیاننامەی پێشەوایەك یان کەسایەتییەك بەوجۆرە نووسرابوویەوە و جگە لەوە هیچ نووسینێکی دیکە لەبەردەستدا نەبوو، ئەوا توێژەر بەناچاری پەنای بۆ دەبات، بەڵام ئەوەی پاك و پوخت و ڕوونە، بیروبۆچوونەکانی و شەرعزانیەکەی دەخاتە ڕوو دەکرێت لێی وەربگیرێت.

خۆ ئەگەر لەو کتێبانە ڕابمێنین کەسەبارەت بەئیمامی دارالهجرە نووسراوە، بەراورد بەو کتێبانەی لەبارەی ئیمامی ئەبوحەنیفە یان ئیمامی شافیعییەوە نووسراون، ئەوا ئەمانەی لەسەر ئیمامی مالیك نووسراون زیادەڕەویان کەمتر تێدا کراوە، وەك دەبینرێت کتێبەکانی (ترتیب المدارك)ی (قاضي فیاض) و (الدیباج المذهب)ی (ابن فرحون)و (مقدمە)ی (زرقانی)، لەشەرحی (الموطأ)و (المناقب)ی (زواوی) زۆر ڕۆچوون و زیادەڕەوی یان کەمکردنەوە لەپایەی کەسانی تریان تێدا نییە، وەك ئەوەی لە کتێبی (مناقب أبی حنیفە)ی (المکی) یان (مناقب الشافعی)ی (فخرالدین الرازی)دا هەیە، ئەگەر جاربەجاریش زیادە پێدا هەڵوتنێك هەبێت لەسنوورێکی دیاریکراودایە، لەوانەیە بنچینەکەی هەواڵێك بێت کەپێیان گەیشتبێت و ڕاست نەبێت، لای هەندێك عەقڵ قبوڵکراو بێت.

بۆ خوێنەر هەیە پرسیار بکات: بۆچی ئەو کتێبانەی لەبارەی ئەبوحەنیفە و شافیعییەوە نووسراون، پڕن لەپیاهەڵدانی زۆر و زیادەڕەویکردن و تانەدان لەکەسانی تر؟ بەڵام ئەو کتێبانەی لەبارەی مالیکەوە نووسراون تانەیان لەکەسانی تر تێدا کەمە، یان نییە و زۆریش زیادەڕەوی نەکراووە لەوەسفکردنیدا؟ وەڵامەکەش ئەوەیە ئەو مشتومڕەی لەسەدەی چوارەمدا لەعێراق و هەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی هەموویان هاتە ئارا، زیاتر لەنێوان

شافیعییەکان و حەنەفییەکاندا بوو، مالیکییەکان لەزۆربەی سەردەمەکاندا پەیوەندییان پێیەوە نەبووە، ئەو مشتومڕە ئاگری ئاشووبی لەنێوان شوێنکەوتووانی ئەو دوو مەزهەبەدا هەڵگیرساندبوو، دەرئەنجامەکەشی نووسینی ئەو کتێبانەی لێکەوتەوە کەزیادەڕۆی دەکات لەپیاهەڵدان و ستایشی ئەوەی خۆی لایەندارییەتی و کەمکردنەوە لەپایەی بەرانبەرەکەی، بەڵام مالیکییەکان لەئەندەلوس و ڕۆژئاواو و باکووری ئەفریقیا بوون، دووربوون لەو ململانێ و مشتومڕە.

سەبارەت بەژیانی دایك و باوکی، یاخود ژیانی منداڵیی ئیمامی مالیك، زانیاری ئەوتۆمان دەست نەکەوت، ئەمەش کاریگەری هەیە لەسەر لێکۆڵینەوە لەژیانی ئەم زانا پێشەوایە، ئەگەر تۆو بنەڕەتی ئەو ڕووەکە گەڵادارە بێت کەسێبەری هەیە، ئەوا ژیانی سەرەتای پاکی، بناغەی ئەو ژیانە زانستییە ئاسۆ فراوانەی ئیمامی مالیکە.

ئەوەی هەیە دەبێت لەنێو هەواڵ و سەربوردەکاندا بدۆزرێتەوە، ژیانی شاری مەدینە لەهەردوو سەردەمی ئەمەوییەکان و عەباسییەکانیشدا سادە و ساکار بووە، خەڵکەکەی هیچ جیاوازییان لەنێودا نەبووە، لەپاش گوێزرانەوەی پایتەخت لەشاری مەدینە ئیدی گۆڕانکاری بەسەر ژیانی ئاساییدا هات تێیدا، خۆ ئەگەر گۆڕی پێغەمبەری خودا و یەکێك لەو سێ مزگەوتەی تێدا نەبووایە،

کەموسڵمانان ڕووی تێدەکەن ئەوا ژیانێکی بیابان نشینی دەبوو، وەك ناوچەکانی نزیکی.

ژیانی ئیمامی مالیك بەزۆری لەشاری مەدینەدا بووە، بەکەمی لێی چووەتەدەر، مەگەر بۆ عەمرە و حەج چوبێتە شاری مەککە، نەزانراوە سەردانی وڵات و ناوچەی تری کردبێت، ئەم وەك ئیمامی شافیعی کەقوتابی بووە لای، حەزی لەسەفەر نەکردووە، وەك ئەبوحەنیفەش نەگەڕاوە، بەڵکو ژیان و مانەوە لەشاری مەدینە و لەپەنای پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) هەڵبژاردووە.

لەوەرزی حەجدا پۆل پۆل خەڵکی دەهاتنە شاری مەدینە بۆ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر، بۆن و بەرامەی وەحییان دەکرد لەم شارەدا، ئەو شارەی بەشی زۆری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی تێدا هاتبووە خوارێ.

لەهەموو ناوچە و گۆشەیەکی وڵاتانەوە خەڵك ڕوویان دەکردە مەدینە، ئەمەش ئەو دەرفەتەی ڕەخساندبوو کەئیمامی مالیك خەڵکی جۆراو جۆر ببینێت، کەشێوە و داب و نەریت و زمانیان جیاواز بوو، ئەمەش کەرەستەیەکی باش بوو بۆ تێگەیشتنی زیاتر لەفقهەکەیدا، بەبێ ئەوەی پێویست بەوە بکات بچێت سەفەری ئەو ناوچە و وڵاتانە بکات. خەڵکەکەی دەهاتنە مەدینە دەیبینین، ئەمەش ئەو هۆکارە سەیرەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کەمەزهەبی ئیمامی مالیك کەخۆی

تەنها لەشاری مەدینەدا ژیاوە کەچی شوێنکەوتووانی مەزهەبەکەی لەو ناوچە و شوێنانەیە کەزۆر لەمەدینەوە دوورن.

زانستخوازانێکی زۆر لەناوچەی جیاوازەوە ڕوویان دەکردە شاری مەدینەو پێیان خۆش بوو لەپەنای گۆڕی پێغەمبەردا بمێننەوە، بوونی ئیمامی مالیك لەو شارەدا وایکردبوو بێن و لەخزمەتیدا لەزانستەکەی بەهرەمەند بن، ئەمەش دەرفەتی ڕەخساند ئیمامی مالیك زانیاری لەبارەی زۆر شوێن و ناوچەی ئیسلامییەوە هەبێت، کەنەچووبووە سەردانیان و لەداب و نەریت و شێوەی مامەڵە و ڕەفتاریان ئاگادار بێت.

لەڕێگەی ئەمەشەوە مەزهەبەکەی زیاتر لەوڵاتی میسر و وڵاتانی ڕۆژئاوای عەرەبی بڵاو بوویەوە، لەکاتێکدا کەئیمامی مالیك هێشتا لەژیاندا بوو.

ئەمەش لەدوو لاوە سوودی بۆ مەزهەبەکەی هەبوو: یەکەمیان ئەوە بوو لەگەڵ قوتابییەکانیدا هەوڵی دەدا لەداب و نەریتی خەڵکانی جیاواز ئاشنا ببێت و ڕەنگدانەوەی هەبێت لەسەر فیقهەکەی، دووەمیشیان: بڵاوبوونەوەی فەتواکانی لەناوچە دوورو جیاوازەکان و زۆری فەتواکانی، فراوانی چوارچێوەی بڵاوبوونەوەی و پابەندی خەڵکی ئەو ناوچانە بەمەزهەبەکەیەوە و هەڵێنجانی لقی نوێ و پەروەردەبوونی زانایانێك کەڕاڤەی مەزهەبەکەی دەکەن و

دەوڵەمەندی دەکەن، ئەمەش وایکردووە مەزهەبی ئیمامی مالیك پێویست بەگریمانە و ئەگەری ڕوودانی ڕووداوی زۆر نەبێت وەك ئەوەی لەفیقهی عێراقیدا هەیە، بەڵکو فیقهێکە تەنها لەسەر ئەو ڕووداوانە بووە کەڕوویانداوە.

بابەتێکی دیکە کەلەم پێشەکیەدا بەپێویستی بزانین ئاماژەی بۆ بکەین ئەویش دیراسەتە فیقهیەکانیەتی، سێ شت ڕووبەڕوومان دەبێتەوە لەکاتی لێکۆڵینەوە لێیان:

یەکەمیان: چۆن ئەو فیقهە نووسرایەوە، چۆن کۆکرایەوە و نەوە لەدوای نەوە گواستیانەوە.

دووەمیان: ئوصولەکانی ئەم مەزهەبە چین و چۆن دەرهێنراوە، چۆن ئیمام خۆی پابەند کردووە پێیانەوە.

سێیەمیان: بابەتێکە ڕەنگە زۆری لەبارەوە نوسرابێت، ئەویش ڕادەی پابەندبوونی بووە بەئەسەرەوە ئەگەر هاتوو دژ بوو لەگەڵ ئوصولدا، یان بەدەربڕینێکی وردتر ئایا مالیك هەرگیز پەنای بۆ ڕەئی نەبردووە، یاخود بوارێکی هەبووە کەلەئەهلی عێراق نزیکبووەتەوە یان دوورکەوتووەتەوە لەوەرگرتنی ڕەئیدا، ئەگەرچی ڕەئی پێچەوانەی ڕێگە و ڕێبازی مەزهەبەکەیەتی.

لێرەدا بەکورتی لەمبارەیەوە ئەدوێین:

سەبارەت بەیەکەمیان کەچۆن مەزهەبەکەی نووسراوەتەوە، ئەم مەزهەبە خاوەنی دوو کتێبە کەوەك دوو بنچینەی مەزهەبەکە دادەنرێت و بۆی دەگەڕێنەوە، ئەوانیش لەخۆگری کۆکراوەی هەموو فیقهەکەینی بەشێوەیەکی تەواو، ئەو دوو کتێبەش: (الموطأ)و (المدونه الکبری)یە.

لە کتێبی (الموطأ)دا، ئیمامی مالیك فەرموودە صەحیحەکان و هەواڵ و ئاسار و فەتوای هاوەڵان و تابیعینی کۆکردووەتەوە، بۆچوونی خۆیشی لەسەری خستووەتە ڕوو، ئەم کتێبەش درانە پاڵی ئیمامی مالیك تەواو ڕاستە و گومان هەڵناگرێت، ئەگەرچی ئەم کتێبە لەبنەڕەتدا فەرموودەی لەخۆ گرتووە بەڵام کتێبێکی فیقهییە، ئەو فەرموودانەی تێدایە کەئیمامی مالیکی هێناویەتی هەڵسەنگاندنی بۆ ڕاویەکانی کردووە و فیقهەکەی لێوەرگرتووە.

کتێبی (المدونه الکبری)ش ئەگەرچی ئیمامی مالیك خۆی نەی نووسیووە وەك (الموطأ)، بەڵکو لەپاش خۆی نووسراوە، بنیچنەی نووسینەکەی وەك ئەوەی باس کراوە هەندێك لەهاوەڵانی مالیك کتێبەکانی محمدی هاوڕێی ئەبوحەنیفەیان بینیووە، ویستوویانە فەتواکانی ئیمامی مالیك بەو شێوەیە دەربهێنن، ئەوەی بینیبێتیان ئیمامی مالیك قسەی لەسەر کردووە هێناویانە، ئەوەشی لێی

نەدوابێت ئیجتیهادیان کردووە بەقیاس بۆچوونی خۆیان لەسەر داوە، کۆی ئەو فەتوایانە نووسراوەتەوە، لەبەر ئەوە (المدونە الکبری) کە (سحنون) گێڕاویەتییەوە، بەمەش بۆچوونەکانی ئیمامی مالیکی بەدەق کۆکردووەتەوە، لەگەڵ ئەوانەی کەدەکرێت هەڵێنجان بێت لەفەتواکانی، بەمجۆرە دەکرێت بەوێنەیەکی مەزهەبی مالیکی دابنێین وەك ئەوەی هاوڕێیانی لەسەر ڕێبازەکەی ڕۆشتوون، لەبارەی بۆچوونەکانیشییەوە فەزڵی ئیجتیهادیان هەبووە.

سەبارەت بەبنچینەی مەزهەبی ئیمامی مالیکیش کەلەکاتی دەرهێنانی حوکمەکاندا پابەند بووە پێیەوە، دەبینین مالیك هیچ دەقێکی ڕاشکاوی نییە لەسەر ئەم بابەتە وەك ئەوەی قوتابییەکانی ئیمامی شافیعی لەپاش خۆی کردیان، هاتن ئەو بنچینانەی ئیمامی شافیعی لەکاتی دەرهێنانی حوکمدا پێیانەوە پابەند بووە نووسی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوێنەری کتێبی (الموطأ)، بەوردی دەتوانێت ئەو بنچینانە ئاشنا ببێت کەئیمامی مالیك ئیجتیهادەکانی لەچوارچێوەیاندا بووە.

هەروەها بەلێکۆڵینەوەی وردیش لە کتێبی (المدونە) زۆری تر ئاشکرا دەبێت لەبنچینەکان، لەو نامانەشیدا کە بۆ موجتەهیدە هاوچەرخەکانی خۆی نووسیووە ئەو بنچینانەی ڕاگەیاندووە، وەك ئەوەی لەنامەکەیدا بۆ لەیسی کوڕی سەعد هاتووە، بیروڕاگۆڕینەوەی

ئەم دوو ئیمامە پایە بەرزە لەبنچینەکانی دەرهێنانی حوکمدا، دەرخەری سەرچاوەکانی دەرهێنانی حوکمە لای ئیمامی مالیك، ئەمەش وەڵامی بابەتی دووەمیان بوو لەسێ بابەتەکە.

بابەتی سێهەمیش بابەتی ڕەئییە لای ئیمامی مالیك، ئایا هەر نەبووە، وەك ئەوەی لەکتێبە هاوچەرخەکاندا ئیمامی مالیك بەشەرعزانی ئەسەر ناودەبرێت نەك شەرعزانی خاوەن ڕەئی، شەرعزانانی مەدینە لەدەرهێنانی حوکمدا وەك زانراوە بۆ ئەسەر گەڕاوەنەتەوە، شەرعزانانی عێراق بۆ ڕەئی گەڕاوەنەتەوە. بەڵام لەکاتی لێکۆڵینەوەمان لەژیانی ئیمامی مالیك، بینیمان بەهەمان شێوە شەرعزانی ڕەئیش بووە، ئەوەی لەکتێبە هاوچەرخەکاندا لەبارەی شەرعزانانی مەدینەوە دەوترێت بەتەواوەتی لەگەڵ فیقهی ئیمامی مالیکدا ناگونجێت، ڕەئیشی هەبووە، بەڵام ڕەئی ئیمامی مالیك جیاوازە لەو ڕەئییەی کەئەبوحەنیفە و تەواوی شەرعزانانی عێراق هەڵیان بژاردووە لەهەموو ڕوویەکەوە، جیاوازیەکەش لەشێوازی دەرهێنانی حوکمدا بووە بەڕەئی، نەك لەڕادەیدا.

وادیارە ئەوە تێگەیشتنی زانایانی پێشووش بووە بۆ مالیك، ئەوان بڕیاریان داوە کەلەپاڵ ئەو پێگەیەی لەفەرمووده و هەڵسەنگاندنی بۆ گێڕانەوە هەیبووە، شەرعزانێکە ڕەئیشی هەبووە.

لەفەرموودەی کۆڵیوەتەوە هەندێ لەگێڕانەوەکانی لاواز کردووە، کاتێك بەئوصولی فیقهی دەرهێنراو لەقورئان و سوننەت و ئەوەی خەڵکی شاری مەدینە لەکاتی وەفاتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێت)، تا سەردەمی ئیمامی مالیك لەسەری بوون هەڵسەنگاندنی بۆ کردووە.

دەشبینین کەئیمامی شافیعی (خوا لێی ڕازی بێت) لەکتێبی (اختلاف مالك)دا، لەزۆر شتدا پێچەوانەی ئەوەیە کەئیمامی مالیك بۆی چووە، هەروەها ڕەئی یەك نەبووە لەگەڵ ژینگەی هەندێ لەگێڕانەوەی فەرموودەکان، دەبینین لەکتێبی (إبطال الاستحسان)یشدا ڕەخنە لەمالیکییەکان و جگە لەوانیش دەگرێت، کەپشتیان بەڕەئییەك بەستووە کەبنەڕەتەکەی قیاس نەبووە، هەروەها لەکتێبی (جماع العلم)دا ڕەخنەی ئەوە لەمالیکییەکان دەگرێت، کەکاریان بەکاری خەڵکی مەدینە کردووە و هەندێ لەگێڕانەوەیان فەرامۆش کردووە، هەموو ئەمانە لەسەر ئەو بنەمایە نییە کەمالیك لەگەڵ ئەوەی فەرموودەناس بووە فەقیهـ بووە زیاتر لە ڕەئی.

لەلایەکی ترەوە دەبینین کە ئیبن قوتەیبە لەکتێبی (المعارف)دا ئیمامی مالیکی لەخاوەن ڕەئییان داناوە، لەگەڵ ئیبن ئەبی لەیلا و

ئەبوحەنیفە و ئەبو یوسف و محمدی کوڕی حەسەن دا لەژێر ناوی (أصحاب الرأی)دا پۆلینی کردووە.

لەوانەیە سەرنجی زۆری هێنانی ڕەئی دابێت لەلایەن ئیمامی مالیکەوە، بەمەش ئەو بیردۆزە هەرەس دەهێنێت کەبڕیاری وابوو بەهۆی کەمی فەرموودەوە ڕەئی لەفیقهدا زۆر بووە، چونکە ئیمامی مالیك زۆر لەفەرموودە ئاگادار بوو، زۆریشی لابوو، بەڵام ئەو ڕووداو و بابەتانەی ڕوویاندا و پرسیاریان لەبارەوە کراوە لێی بەڕادەیەکی زۆر بووە، بۆیە پێویستی بەڕەئی کردووە.

بەڵام لەکارکردنی بەڕەئی بەهەمان شێوەی ئەهلی عێراق نەبووە، بەڵکو ڕێبازی بەوشێوەیە بووە مەصڵەحەت لەهەر کارێکدا بزانێت کەلەقورئان و فەرموودەدا لەبارەیەوە دەق نەهاتووە، چونکە مەصلەحەت لای ئەو پێودانگ بووە بۆ هەر شتێکی شەرعی و ناشەرعی، بەهۆی ئەوەی دەقێك نەبوو لەقورئان و سوننەتدا یان لە ئەسەردا کەحەرام بێت، بەمەش ئەو شەریعەتی ئیسلامی بەجۆرێك تێگەیشتووە کەنزیکی بخاتەوە لەمەصلەحەتی خەڵك، چونکە تەنها بۆ زاهیدەکان نەهاتووە، بەڵکو بۆ هەموو خەڵك هاتووە، خەڵکیش تێیدا نموونەی باڵان و تێیدا ڕێزگرتنی بەرژەوەندییە پاکەکان دەبیننەوە.

بەمشێوەیە لێکۆڵینەوەمان لەسەر ژیانی ئیمامی مالیك کردووە، دەبینین شەرعزانێکە و فیقهەکەی زۆر فراوانە، توانیوویەتی هاوشانی سەردەمە جیاوازەکان و شارستانیەتە جیاوازەکان بڕوات، تەنانەت دەبینین بۆچوونەکانی مەزهەبی مالیکی لەگەڵ زۆربەی ئەوەی ڕۆژئاوا لەڕەئیدا پێی گەیشتووە دەگونجێت، چونکە ئەم مەزهەبە پایەبەرزە فیقهی ڕەئی لەژیانی مرۆڤایەتییەوە وەرگرتووە، لەسەر بناغەی هێنانی زۆرترین سوودمەندی و وەلانانی زۆرترین زیانگەیەنەر بنیات نراوە.

ئەم هێڵانەی کێشاومانە بۆ خوێنەر ڕوون دەکەنەوە کە چ مەنهەجێکمان هەبووە لەلێکۆڵینەوەی ژیانی ئەم ئیمامە پایە بەرزەدا، لەخوای گەورە داواکارین یارمەتیدەر و سەرخەرمان بێت و هەر ئەو ڕێنماییکارە بۆ ڕێگای ڕاست.

***

# ژیانی ئیمامی مالیك
# (ڕەزای خوای لێ بێت)

## لەدایکبوونی:

زانا و مێژوونووسان سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی ئیمامی مالیك یەك ڕا نین و جیاوازییان هەیە. هەندێك پێیان وابووە ساڵی (٩٠ك) لەدایك بووە، بەڵام ڕایەکی تر دەڵێت (٩٣ك) بووە، هەروەها وتراوە: (٩٤ك) و (٩٥ك) و (٩٦ك) و تەنانەت (٩٨ك).

بەڵام ڕای زۆرینە ساڵی (٩٣ك) و بەهێزترین بەڵگەیش وتەی خۆی بووە کە وتویەتی: ساڵی (٩٣) لەدایکبووم.

لەلایەکی تریشەوە ڕیوایەتەکانی لەسەر ماوەی مانەوەی ئیمامی مالیك لە سکی دایکیدا ڕای سەیریان هەیە، هەندێك دەڵێن سێ ساڵ و هەندێك دەڵێن دوو ساڵ، ئەمەش سەرچاوەی لەو ڕیوایەتەی (الواقدی)یەوە گرتووە کە دەڵێت:

((گوێم لە ئیمامی مالیك بوو دەیوت: لەوانەیە سکپڕی ماوەکەی سێ ساڵ بخایەنێت، هەندێك خەڵك هەیە سێ ساڵ لە سکی دایکیدا بووە، لێرەدا مەبەستی خۆی بووە)).

بەم ڕووداوە ویستوویانە ئیمامی مالیك وا دەربخەن کە کەسێکی نائاسایی بووە، تەنانەت ماوەی مانەوەی نێو سکی دایکیشی، هەروەك کارەکانی ناوازە و تایبەت بوون.

ئەگەر ئەمە ڕای ئیمامی مالیکیش بوبێ، لەوانەیە سودی لە شارەزایی هەندێ دایکانی سەردەمی خۆی و پێشین بینیبێت و جێگەی پابەندبوون نییە، چونکە لایەنی پزیشکی سەلماندویانە کە ماوەی سکپڕی لە ساڵێك تێپەڕ ناکات و زۆرینەی نۆمانگ دەبێت.

ڕای دروست ئەوەیە کەسێکی ئاسایی بووە و زۆری و کەمی ئەو ماوەیە هیچ کاریگەریی نییە لەسەر پلەوپایەی ئیمام، قبوڵ نەکردنی ئەم ڕیوایەتە لەلایەنی عەقڵی و پزیشکی و عادەت و عورفەوە شتێکی زۆر ئاساییە، چونکە بنچینەیەکی جێگیرە و چەسپاوە.

ئیمامی مالیك لەشاری مەدینە چاوی بە دنیا هەڵهێناوە و شوێنەواری هاوەڵان و شوێنکەوتوانی بە چاوەکانی خۆی بینیوە، لەلای گۆڕی پێغەمبەردا و لەنێو شارە پیرۆزەکەیدا پێگەیشتووە، کە لانکەی زانست و سەرچاوەی ڕووناکی و نور و زانین بووە.

ئەمەش وایکردووە پیرۆز ڕاگرتنی ئەو شارە کاریگەری لەسەر دابنێت و لە بۆچوون و ژیانیدا ڕەنگبداتەوە، بەجۆرێك لەنێو شارەکەدا بە سواری وڵاغ نەگەڕاوە، جگە لەوەش لە ئیجتیهادەکانیدا هەمیشە ئەوەی لە مەدینەدا پەیڕەوکراوە بە گرنگی گرتوە، بەجۆرێك کردبویە یەکێك لە سەرچاوەکانی هەڵهێنجاندنی ئیجتیهادەکانی.

## ڕەچەڵەکی:

بە هەمان شێوەی لەدایکبونەکەی، بۆچوونی جیاواز لەسەر ڕەچەڵەکی ئیمامی مالیك هەیە، بەڵام زۆربەیان بۆچون و ڕای لاواز و بێ بەڵگەن، بەهێزترینیان ئەوەیە ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ هۆزێکی یەمەنی (ذو أصبح). ناوی تەواوی (مالیکی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەبی عامری ئەصبەحی یەمەنی)یە.

دایکی ناوی (عالیەی کچی شەریکی ئەزدی) بووە، دایك و باوکی عەرەبی یەمەن بوون، هەرگیز نەبورنەتە کۆیلە. ئەمەش ڕای زۆرینەیە و سەلمێنراوە، هەرچەندە لە هەندێ لە کتێبەکانی (سیرە)دا باسوخواسی سەیری لێوەکراوە، وەك (ابن شهاب الزهری) لە بەشی (الصرم)دا بەپێی مامەی (أبو سهیل) بە موالی هەژماری کردووە.

چونکه ئیمامی مالیك خۆی ئەمەی ڕەت کردۆتەوە و جەختی کردۆتەوە لێی، لەلایەکی تریشەوە خاوەنی ئەم ڕایە (محمدی کوڕی إسحاق)ە، خاوەنی کتێبی (السیرە) و ڕای وەرناگیرێت و لە ڕاستگۆییدا هێمای لەسەرە.

لەڕاستیدا هاوپەیمانییەك لە نێوان باپیری مالیك و (عبدالرحمن کوڕی عوسمان کوڕی عبیدالله)دا هەبووە، نەك (ولاء) و خزمەتکاری، ئەمەش لەنێو ئازادەکاندا شتێکی ئاسایی بووە و لە هەموو شتێکدا هاوپەیمان بوون.

هەروەها (أبو سهیل) دەڵێت: ئێمە لەهۆزی (ذي أصبح)ین و باپیرەمان لە یەمەنەوە هاتۆتە مەدینە و ژنی لە (تیم)یەکان هێناوە، لەگەڵیاندا ژیاوە و ڕەچەڵەکمان لەسەر ئەوان حساب کراوە.

ئەمەش دەیسەلمێنێت کە هاوپەیمانی لەگەڵ (ئەبوعامر)دا بووە نەك (مالیك)ی باپیرەی ئیمام.

پوختەی هاوپەیمانیەکەشی پەیوەندی ژن و ژنخوازی پێکەوەی بەستوونەتەوە.

جگە لەمانەش مێژوونووسان پێیان وایە کە (ابوعامر)ی باپیرە گەورەی، لەسەردەمی پێغەمبەردا هاتۆتە مەدینە و بەشداری هەموو غەزاکانی لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە، جگە لە (بەدر) نەبێت، هەروەها (مالیك)ی ناسراوە بە (أبو أنس) لە گەورە شوێنکەوتوان

بووه، چەندین ڕیوایەتی لە (عەمر) و (طه لحة) و عائیشه) و (أبو هورەیره) و (حەسانی کوڕی ثابت)ەوە گێڕاوەتەوە.

جگە لەمەش یەکێك بووە لەو چوار کەسەی کە بەشەو ئیمامی (عثمان)یان بە خاك سپاردووه.

ئەگەرچی جیاوازییەکی کەم لەنێوان مێژوونووسان و زانایاندا هەبێ، بەڵام هەموان جەخت لە هاتنیان دەکەن لە یەمەنەوه.

## پێگەیشتنی:

ئیمامی مالیك لەنێو ماڵ و بنەماڵەیەکدا گەورەبوو، کە سەرقاڵی زانستی فەرموودە و شوێنەوار و هەواڵ و فتوای هاوەڵان بوون، مالیکی باپیرەی یەکێك بوو لە گەورە زانایانی شوێنکەوتوان و ڕیوایەتی لە (عومەری کوڕی خەتاب) و (عوسمانی کوڕی عەفان) و (تەڵحەی کوڕی عوبەیدالله) و (عائیشە)ی دایکی ئیمانداران‌ەوە گێڕاوەتەوە.

هەروەها (ئەبوسهیل)ی مامەی و (نەضر)ی برای لەو بوارەدا بەناوبانگ بوون.

هەرچەندە باوکی ئیمامی مالیك (ئەنەس) سەرقاڵی بواری فەرموودەناسی نەبووە و ئەو ڕیوایەتانەشی باسی لێوە دەکرێت لاوازن و زانایان ئاماژەیان پێکردووە، وەك (خطیب البغدادی)

دەڵێت: لەو بوارەدا کاری نەکردووە، ئەگینا لە پێشترین بوو تا ببێتە مامۆستای کوڕەکەی و لێیەوە ڕیوایەت بکات.

بەڵام پێش ئیمامی مالیك (نەضر)ی برای زۆر بە پلەوپایەو ناودار بووە، بەجۆرێك کە ئیمامی مالیك چۆتە نێو کۆڕی زانست و زانیاری، پێی وتراوە براکەی (نەضر)، بەڵام دواتر و پاش دەرکەوتنی بەهرەکانی و بەرەوپێش چوونی لە زانست و فەرموودەناسی و فیقهدا، بە (نەضر) وتراوە (نەضری برای مالیك)، ڕەزای خوا لە هەردوکیان.

بەم جۆرە هەر لە سەرەتاوە لەنێو بنەماڵەیەکی زانستیدا پێگەیشتووە و ڕووی لەنێو کۆڕی عیلم و فەرموودە کردووە.

## ژینگەکەی:

ئەو ژینگە و دەوروبەرەی تێیدا ژیا و ئەو ئاسمانەی لەژێریدا گەورە بوو، ئەو زەوییەی پێی لەسەر دانا شاری پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم)، شوێنی کۆچ بۆکراوان بوو، سەرچاوە و چاوگەی شەرع و نور و یەکەم شوێن بوو حوکمی خودای تێدا چەسپاو و پەیڕەوکرا، لە سەردەمی هەر چوار خەلیفەکەدا هەروەك سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر بە پایەداری مایەوە، تەنانەت لە سەردەمی ئەمەوییەکانیشدا پێگەی خۆی لەدەست نەدا.

ڕێز و قەدری ئەو شارە بەجۆرێك بوو، کاتێك (عبدالله کوڕی مەسعود) لە عێراق سەبارەت بە شتێك پرسیاری لێبکرایە و وەڵامی بدایەتەوە، کە دەگەڕایەوە مەدینە بەشێوەی ئەوان نەبوایە، دەگەڕایەوە و فتواکەی بەپێی مەدینە بە یەك یەکەیان دەگەیاندەوە.

تەنانەت لە سەرەمی (عومەری کوڕی عبدالعزیز)یشدا، داوای لە (ابن حەزم) کرد سوننەت و فیقه بەپێی ئەهلی مەدینە بۆ بنوسرێتەوە و بە هەموو ناوچەکاندا بڵاوی بکاتەوە، بەڵام کاتێك (ابن حەزم) کتێبەکەی تەواوکرد، فریای (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) نەکەوت و وەفاتی کردبوو.

ئیمامی مالیك لەشارێك گەشەی کرد، پڕ بوو زانست و میراتێکی زۆری پێش خۆی لە زانست و فەرموودە و فتوا، پەرەی دا بە بەهرەکانی و هەر لەسەرەتای ژیانییەوە هەموو قورئانی لەبەرکرد.

پاشان ڕووی لە لەبەرکردنی فەرموودە کرد، پاشان ژینگە و بنەماڵە و بەهرەی خۆی پاڵنەر بوون بۆ ئەوی بڕیار بدات، کە بچێتە کۆڕی زانایان تا فێری زانست بێت و بینووسێتەوە.

***

# خوێندنی

دوای ئەوە بڕیاری دا بڕوات بۆ کۆڕی فێربوونی زانست، دایکی جوانترین جلی بۆ ئامادەکرد و عەمامەکەی بۆ بەست و پێی وت: ئێستا بڕۆ بنوسەوە و وەریگرە، هەموو جارێك پێی دەوت: بڕۆرە خزمەت ڕەبیعە، زانستەکەی پێش ئەدەبەکەی وەربگرە.

وا دەردەکەوێت کاریگەریی زۆری ئەم هاندانەی دایکی لەسەر بووە، بۆیە یەکەمجار چووە خزمەت (ڕەبیعەی الرأی) و فقهی لێ وەرگرت، هەرچەندە لە تەمەندا زۆر بچووك بوو، بەڵام زۆر سوور بوو لەسەر لەبەرکردنی ئەو زانیارییانەی دەینووسین، هەتا دوای گوێگرتن لە وانەکان و نووسینەوەی، دەچووە ژێر سێبەری دارەکان و دەیوتەوە و دوبارەی دەکردەوە، تا خوشکەکەی چاوی پێ دەکەوێت و لای باوکی باسی دەکات، باوکیشی دەڵێت ڕۆڵە ئەوە فەرمودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبەر دەکات.

بەڵام زانستخوازی لە کۆڕی جۆراوجۆر، ئەو بەهرە زانستییە دروست ناکات، کە پێویستە قوتابی لەسەری پێبگات، بەڵکو دەبێ لەنێو زانایاندا لەگەڵ یەکیان بمێنێتەوە و، زۆربەی کاتەکەی لەگەڵ ئەو تایبەت بکات، تا زانستەکە بەتەواوی وەردەگرێت و پێدەگات، هەتا ئەوکاتەی لەسەر دەستی ئەو دەردەچێت و بەرەو خوێندنی

سەربەخۆ دەڕوات، دوای ئەوەی زەخیرەیەکی زانستی ئەوتۆی لا کۆدەبێتەوە کە بتوانێت لە فیکردا سەربەخۆ بێت.

لە (المدارك) هاتووە کە مالیك دەڵێت: برایەکم هەبوو لە تەمەنی (ابن شهاب)، ڕۆژێك باوکم پرسیارێکی لێکردین، وەڵامی براکەم ڕاست بوو و من هەڵەم کرد، باوکم وتی: ڕاکردن بەدوای کۆتراندا لە خوێندن سەرقاڵی کردیت .

منیش توڕە بووم، بۆ ماوەی حەوت ساڵ، لە خزمەت (ابن هورمز) مامەوە و نەچوومە لای کەسی تر. هەندێ خورمام لەگەڵ خۆم دەبرد، دەمدایە منداڵەکانی و پێم دەوتن ئەگەر یەکێك لێی پرسین دەربارەی مامۆستا، بڵێن: سەرقاڵە.

ڕۆژێکیان (ابن هورمز) پرسیار لە خزمەتکارەکەی دەکات کە کێ لە دەرگایە، ئەویش دەبینێت تەنها مالیك لەوێیە، دەگەڕێتەوە و دەڵێت: تەنها ئەو قژزەردەی لێیە. دەڵێت: بانگی بکە، ئەو زانای ئەو خەڵکەیە.

مالیك کیسەیەکی پڕ لۆکەی پێبوو، لەبەر دەرگای (ابن هورمز) لەسەری دادەنیشت، تا لە سەرمای بەردی بەردەرگاکە خۆی بپارێزێت، هەندێکیش دەڵێن بەردی مزگەوتەکە بوو، کە کۆڕی (ابن هورمز)ی لێبووە.

بەم شێوەیە ئیمامی مالیك لە سەرەتای ژیانییەوە و هەر بە منداڵی دەستی بە فێربوون کردووە، دوای ئەوەی ڕادەیەکی باش زانستی وەرگرتبوو پاشان ڕووی لە وەرگرتنی تایبەتمەندی کرد، کە دەبێت دە ساڵان بووبێت، پاشتریش چۆتە خزمەت (ابن هورمز) و زانایانی تریش، (ابن هورمز)ی بە پێشەنگی خۆی زانیوە، تەنانەت سیفەتێك کە جیێ پەنجەی (ابن هورمز)ی پێوە دیار بووە، وشەی (لا أدری) بووە، ئیمامی مالیك سەبارەت بە شتێك پرسیاری لێبکرایە کە نەیزانیبایە دەیفەرموو (نازانم)، چونکە (ابن هورمز) دەڵێت: دەبێت ئەوانەی زانست دەگەیەنن وشەی (لا أدری) بڵێنەوە، چونکە ئەمە بنچینەیەکە بۆ ئەوانەی کاتێك پرسیاریان لێدەکرێت و نازانن دەبێت بڵێن: نازانم.

(ابن وەهەب) دەڵێت: زۆرجار ئیمام مالیك ئەو وشەی بەکار دەهێنا.

ئیمام مالیك بە ڕاشکاوی ناوی (ابن هورمز)ی نەهێناوە، زۆربەی ئەو زانستانەی باس نەکردووە کە ئەو فێری کردووە، بەڵکو لە سەنەدی فەرموودەکانیشدا زۆر باسی نەکردووە، لەسەر ڕاسپاردەی خۆی، وەك وەرع و دینداربیەك، لەترسی ئەوەی خەیاڵێکی خۆی خستبێتە فەرموودەکانەوە و ئەو خەیاڵەی لێوە بگوازێتەوە.

ئیمام مالیك لەبارەیەوە دەڵێت کە زاناترین کەس بووە بۆ وەڵامدانەوەی کەسانی ئارەزووخواز و هەروەها ئەوانەی خەڵك تێیدا ناکۆك بوون.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە زانیاریی زۆری لێوە وەرگرتووە، بەڵام هەموو زانستەکەی بەناو خەڵکدا بڵاو نەدەکردەوە، لە دەرس وتنەوە و گەیاندنی عیلمدا تەنها فەرموودە و فەتوای بابەتی فیقهی بە قوتابیەکانی دەوتەوە و لەو دووانە لای نەدەدا.

## حەزی لەمشتومڕ نەبووە:

لەلایەکی ترەوە ئیمامی مالیك هەرگیز حەزی لەو مشتومڕ و دەمەقاڵێیە نەبوو، کە موعتەزیلە و جەبریە و مورجیئە و خەواریج لەنێو خەڵك دروستیان کردبوو و وەڵامی نەدەدانەوە، ئەمەش لە کەمی زانستی یاخود نەبوونی وەڵام نەبوو بۆیان، بەڵکو لەوسەری دەهاتەوەو دڵنیابوو لەوەی چوونە نێو ئەو مشتومڕانە هیچ بەرهەمێکی نییە و ناگاتە ئامانج.

هەروەها لە (المدارك)دا هاتووە: (یەکێك لە ڕەخنەگرانی موعتەزیلە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: چوومە کۆڕی مالیکی کوڕی ئەنەس و چەند پرسیارێکم لەبارەی قەدەرەوە لێکرد، ئەویش ئاماژەی بۆ کردم کە بێدەنگ بم، دوای ئەوەی خەڵکەکە ڕۆیشتن وتی: ئێستا

بپرسە، پێی خۆش نەبوو لەبەردەم خەڵك وەڵامم بداتەوە، دەڵێ کە هیچ پرسیارێك نەما لێی نەکا و وەڵامی دایەوە، سەلماندی کە بۆچونەکەیان بەتاڵ و بێ بنەمایە).

## خوێندنی لای نافیع

ئیمامی مالیك جگە لە (ابن هورمز)، سەرچاوەیەکی زانیاریی تریشی سود لێ دەبینی، کە (نافع)ی خزمەتکاری (ابن عومەر) بوو، ڕەزای خوای لێ بێت. هەر لە پاڵ (ابن هورمز)دا سوودی زۆری لە زانیارییەکانی بینیوە.

خۆی دەڵێت: (لە نیوەڕۆدا کە دارەکان هیچ سێبەرێکیان نەمابوو، ئەچووم چاوەڕێی هاتنەدەرەوەی (نافع)م دەکرد، پاشان خۆم وا دەردەخست کە ئەوم نەبینیوە، دواتر بەلایدا تێدەپەڕیم و سەلامم لێ دەکرد، لێی دەگەڕام تا دەچووە ژوورەوە، دەچوومە خزمەتی و پرسیارم سەبارەت بە (ابن عومەر) لێدەکرد و وەڵامی دەدامەوە، منیش هەموویم لەبەر دەکرد، هەرچەند کەسێك بوو هەندێك لە توندیی تێدابوو).

دەبینین ئیمامی مالیك زۆر سوور بووە لەسەر وەرگرتنی عیلم، بەجۆرێك بەو نیوەڕۆ گەرمەی ئەو وڵاتە وماڵی (نافیع)یش لە دەرەوەی مەدینە لە (بەقیع) بووە، چاوەڕوانی کردووە بێتە

دەرەوە، لەڕێی مزگەوت پرسیاری لێ بکات و فەرموودە و فیقهی لێ وەربگرێت و زۆری سوود لێ بینیوە.

هەروەها ئیمامی مالیك زانستی لە (ابن شهاب الزهری)ش وەرگرتووە.

لێوەی دەگێڕنەوە کە: جارێکیان (زەهری) هاتە لامان، (ڕەبیعە)شمان لەگەڵ بوو، چل فەرموودە زیاتری بۆ گێڕاینەوە، پاشان بەیانی هاتینەوە لای، (زەهری) وتی: کتێبێك بێنن با بۆتانی باس بکەم، دەزانن دوێنێ چیم بۆ گێڕانەوە؟ (ڕەبیعە) پێی دەڵێ: یەکێك لێرەیە ئەوانەت بۆ دووبارە دەکاتەوە کە دوێنێ گێڕاتەوە، وتی: کێیە؟ وتی: کوڕی (ابوعامر). پێی وت: بڵێ، منیش چل فەرموودەم لەوانە بۆ گێڕایەوە، (زەهری) وتی: پێم وانەبوو کەسێك مابێ ئەوانەی لەبەر بێ جگە لەخۆم.

مالیك سور بوو سوود لە گێڕانەوەکانی (زەهری)یش وەربگرێت، دەڕۆیشتە لای ماڵیان و چاوەڕوانی دەرچوونی دەکرد، کاتێك دەچووە لای کە کەسی لا نەبێت، لێی دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: جەژن هات، وتم ئەمڕۆ (ابن شهاب) دەستی بەتاڵ دەبێت، لە مزگەوت دەرچووم و لەبەر دەرگاکەی دانیشتم. گوێم لێبوو بە خزمەتکارەکەی وت: بزانە کێ لەبەر دەرگایە، تەماشای کرد، گوێم لێبوو وتی: خزمەتکارە قژزەردەکەیە، مالیك، وتی: با بێتە ژوورەوە.. منیش

چوومە ژوورەوە، پێی وتم: دەبینم هێشتا نەگەڕایتەوە بۆ ماڵ خۆتان!

وتم: نا، وتی: هیچت خواردووە، وتم: نا، وتی: فەرموو بخۆ، وتم: پێویستم بە خواردن نییە، وتی: چیت دەوێ، وتم: بۆم بگێڕەوە، وتی چیت پێیە دەری بێنە، تەختەکانم دەرهێنا، چل فەرموودەی بۆ گێڕامەوە، وتم: زیاترم پێ بڵێ، وتی: ئەوەندە بەسە، ئەگەر ئەو فەرموودانەت گێڕایەوە ئەوا تۆ لەوانەیت کە فەرموودەی زۆریان لەبەرە، وتم: بەڵام هەموویم لەبەرە، تەختەکانی لێم وەرگرت و وتی: بۆمی بگێڕەوە، گێڕامەوە، تەختەکانی پێدامەوە و وتی: هەستە، تۆ لە هەڵگرانی زانستیت.

دەگێڕنەوە کە ئەوەندە سوور بووە لەسەر لەبەرکردنی فەرموودەکانی (ابن شهاب)، کە دادەنیشت دەزوویەکی بەدەستەوە بوو، هەر فەرموودەیەکی دەگێڕایەوە، گرێیەکی لە دەزووەکە دەدا، تا بزانێت ژمارەی فەرموودەکان چەند بووەو و چەندی لەیاد ماوە.

لە (المدارك) هاتووە: (ابن شهاب) کە دادەنیشت سی فەرموودەی دەگێڕایەوە، جارێکیان لەگەڵ فەرموودەکان گرێم لە دەزووەکە دەدا، یەکیانم لەیادچوو، کە بینیمەوە، پرسیاری ئەوەم لێکرد، وتی: ئەی لە دانیشتنەکە نەبووی؟ وتم: با، وتی: ئەی بۆ لەبەرت نەکردووە، وتم سی دانەیە، تەنها یەکیانم لەیاد نەماوە، وتی: ئەو

خەڵکە لەبەرکردنیان وەك خۆی نەماوە، هەرگیز هیچ شتێکم نەخستۆتە دڵمەوە و لەیادم چووبێت. ئەوەی لاتە بیڵێ، کە پرسیم، پێی وتم، ئینجا ڕۆشتم.

مالیك هەر لە گەنجییەوە ڕێزێکی تەواوی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەگرت، هەردەم لە حاڵەتێکی هێمنی و ئارامیدا وەری دەگرت، بۆ ڕێزگرتن و وریابوون لە دروستییەکەی، هەربۆیە لەحاڵەتی ڕاوەستان یان لە تەنگەتاوی یان شڵەژان وەری نەدەگرت، تا هیچی لێ لەدەست نەچێت.

– لە (المدارك) هاتووە: پرسیار لە مالیك کرا هیچت لە (عمرو بن دینار) بیستوە، وتی: بینیم قسەی دەکرد و خەڵك بە پێوەبوون شتیان دەنوسی، پێم خۆش نەبوو لە حاڵەتی بەپێوە وەستاندا فەرموودە بنوسمەوە.

– بەلای (أبو زناد)دا تێپەڕی و لای دانەنیشت، دواتر لێی پرسی: بۆ لەلام دانەنیشتی؟ وتی: شوێنەکە تەسك بوو، نەمویست بەپێوە بم و شتێك لە پێغەمبەرەوە بنوسم.

لەوانەی باسمان کرد، سێ شتمان بۆ دەردەکەوێت:

یەکەم: ئەوسا زانست بە گوێگرتن لە زانایان لە زاری خۆیانەوە وەردەگیرا، نەك لە کتێبی نوسراو، هەر بۆیە یادگەی قوتابیان زۆر

چالاك بووە، تەواوی پشت بەستنیان هەر لەسەر ئەوە بووە، هەوڵیان دەدا هەرچیان بیستوە لەیادیان نەچێت. ئەوەتا مالیك بە گرێی دەزوو ژمارەی فەرموودەکانی ڕێکدەخست، دانەیەکی لەیاد بچوبایە دەگەڕایەوە بۆ بیستنی، بەبێ گوێدانە ڕەتکردنەوە و سەرزەنشت. ئەمەش دەری دەخات کە ئەوان چەند گرنگییان بە لەبەرکردن دەدا و سوربوون لەسەر تەواویەتی(ضبط)، بەمەش دڵەکان پاك دەبێتەوە و دەروونەکان بەهێز دەبن.

دووەم: زانایان دەستیان کردبوو بە تۆمارکردن و نووسینەوەی زانست، ئەگەرچی پشتیان بەو نوسراوانە نەدەبەست، ئەوەتا (ابن شهاب) قوتابییەکانی هان دەدات ئەوەی دەیبیستن بینووسنەوە، نەوەك ئەوانەی بیستویانە لێیان ون بێت، ئەوەتا مالیك دەچێتە خزمەتی و تەختەکانی لەدەستە و هەرچی دەیبیستێت بەتەواوی دەینوسێتەوە، ئەگەرچی لەبەریشی کردووە و تێی گەیشتووە.

سێیەم: مالیك بەردەوام بووە لەسەر داواکردنی زانست، لەوەشدا زۆر کۆششی کردوە و چالاك و ئارامگر بووە، گەرمای توند و سوتێنەر ڕێگر نەبووە لەماڵ دەرچێت و چاوەڕوانی دەرچوونی زانایان بکات لەماڵ بەرەو مزگەوت، توندیی ئەوانیش ڕێگر نابێت کە لێیانەوە فێربێت، هەندێك جار بەرگەی ڕووگرژی و سەرزەنشتیش دەگرێت، بە هێمنی و ژیری و نەرمونیانیەکەی بەپێی توانا خۆی لە

توڕەبوونیان بەدوور دەخست، هەموو کاتەکانی بۆ زانایان تەرخان دەکرد.

لەگەڵ کۆششەکەی، سامانێکی زۆریشی لەو ڕێیە خەرج کرد، (ابن القاسم) دەڵێت: زانستخوازی وای لە مالیك کرد هەتا بنمیچی خانوەکەی هەڵوەشێنێتەوە و دارەکانی بفرۆشێت، پاشتر دونیا بەسەریدا ڕژا.

## ئەو زانستانەی وەری گرت:

مالیك لە چوار لاوە زانستی وەردەگرت، کە بە هەموویان زانایەکی شارەزای لێ دێتەدی، کە شوێنەوارەکان وەك خۆی بزانێت و، شارەزایی هەبێت لە دەربڕینی ڕەئی لەجێی خۆی و، پەیوەندی هەبێت بە گیانی سەردەمەکەی و، بزانێت چی لە دەوروبەری دەگوزەرێ، جا لەنێو دەروازەکانی زانستدا، ئەوانە بە خەڵك دەبەخشێت کە دەزانێ بەسودە بۆیان.

١- شارەزا بووبوو لە وەڵامدانەوەی ئارەزووخوازەکان و ئەوانەی خەڵك تێیدا ناکۆکن و، ئەو جیاوازییە فیقهی و نافیقهییانەی لەو سەردەمەدا هەبووە، ئەمانەشی لە (ابن هورمز) وەرگرتووە، وەك خۆی دەڵێ زانستێکی زۆری لێ وەرگرتووە و بەپێویستی زانیوە بیزانێت، بەڵام لەناو خەڵك بڵاوی نەکردۆتەوە، وەك ئەوەی زانست

دابەش بکات بۆ دوو بەش، بەشێکیان دەخرێتە بەردەست جەماوەر و کەس پێی تایبەتمەند نییە، چونکە زیان بە کەس ناگەیەنێت و هەموو ژیرییەك دەتوانێت وەری بگرێت و لەگەڵی بگونجێت و پێی سودمەند بێت. بەشێکیش تەنها کەسانێکی تایبەتمەند دەبێ بیزانن و ناخرێتە بەردەست خەڵك، چونکە زیانەکەی بۆ هەندێك کەس لە سودەکەی زیاترە، وەك وەڵامدانەوەی ئارەزووخوازەکان، کە لەوانەیە هەندێك ژیریی پێی قبوڵ نەکرێ، یان بە هەڵە لێی تێبگەن، لەجیاتی سوود، بەزیان بکەوێتەوە.

٢- مالیك فەتوای هاوەڵانی لە تابیعییەکان و تابیعی تابیعییەکان، ئەوانەی پێیان گەیشت، ئەوانەش کە پێیان نەگەیشت وەردەگرت. فەتوای عومەر و ابن عومەر و عائیشە و هاوەڵانی دیکەی وەرگرت، لەگەڵ فەتواکانی (ابن المسیب) و هی دیکەش لە گەورە تابیعیەکانی پێیان گەیشت. فیقهی هاوەڵان و گەورە تابیعییەکان سەرچاوەی زۆرێك لە پەلوپۆ فیقهیەکانی مالیکی بوون.

ئەو شوێن ڕاویەکان دەکەوت و ئەوانەی هەڵدەبژارد کە جێی متمانە و شارەزان، تا فەرموودەیان لێ وەربگرێت، فیراسەتێکی بەهێزی هەبوو لە تێگەیشتنی کەسەکان و دەرك کردن بە توانای ژیریی و شارەزاییان، لێی دەگێڕنەوە کە وتویەتی: (ئەم زانستە ئایینە، سەرنج بدەن لەکێی وەردەگرن، لای ئەو ستونانە،-ئاماژەی

بە مزگەوتەکە دەکرد- بە حەفتا کەس گەیشتم لەوانەی دەڵێن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، هیچم لێیان وەرنەگرت، ئەگەرچی هەریەکێکیان بکرایەتە ئەمینداری (بيت المال) دەستپاك دەبوو، بەڵام شایستەی ئەو شوێنە نەبوون).

## دانیشتنی بۆ وانە وتنەوە و فەتوادان:

دوای تەوابوونی خوێندن، مالیك لە مزگەوتی پێغەمبەر شوێنێکی گرت بۆ وانەوتنەوە و فەتوادان، بێگومان ئەوەی لەو شوێنە دادەنیشێت دەبێ زانیاریی زۆری هەبێت، لە حاڵەتێکی ڕێزداری و گرانی و هەیبەتدا بێت، کە بواری پێ بدات ببێتە جێ مەبەستی قوتابیانی فیقه و داواکاری فەتوا و، جێی متمانەیان بێت و، وتەکانی لەبەرچاو بگیرێت. لەوکاتەدا مالیك بەو شێوەیە بوو، خۆیشی هەوڵی دەدا لە ڕای مامۆستاکانی و بڕیاریان بۆ شایستەییەکەی دڵنیابێتەوە، زۆرجاران دەیوت: (خێر لە کەسێکدا نییە خۆی لە حاڵێکدا دەبینێت کە خەڵك بە شایستەی نازانن).

سەبارەت بە مەجلیسی فەتوا دەیوت: (هەرکەس حەز بکات لە مزگەوت دابنیشت بۆ گێڕانەوەی فەرموودە و فەتوادان، دانانیشێت تا ڕاوێژ بە کەسە چاك و ڕێزدارەکان و لایەنەکانی مزگەوت نەکات،

ئەگەر بینیان گونجاوە دادەنیشێت، من دانەنیشتم تا حەفتا مامۆستای زانا گەواهیی بۆ دام کە لەو ئاستەدام).

پیاوێك هات و پرسیارێکی لە مالیك کرد، (ابن قاسم) دەستپێشخەریی کرد و فەتوای بۆ دا، مالیك لێی تورەبوو، پێی وت: چۆن جورئەتت کرد فەتوا بدەیت!! هەر دووبارەی دەکردەوە، فەتوام نەدا هەتا پرسیارم نەکرد، کە من شایستەی ئەو شوێنەم؟ کە سارد بوویەوە لێی پرسی: لەکێت دەپرسی؟ وتی: (زەهری) و (ڕەبیعە).

بەپێی ئەو هەواڵانەی پێمان گەیشتووە، مالیك فەتوای نەدا تا تەواو پێگەیشت و، حەفتا لە زانا متمانەپێکراوەکانی گەواهییان بۆ دا.

سەبارەت بەوەی لە چ تەمەنێکدا دەستی کرد بە فەتوادان، گێڕانەوەیەکی دروست لەمبارەیەوە نییە، بەڵام ژیربێژی پێمان دەڵێت کە لە تەمەنی پیاوەتیدا بووە، چونکە ناشێت گەنجێك لەنێو ئەو زانا گەورەگەورانە بگاتە پایەی فەتوادان و نەگەیشتبێتە تەمەنی پیاوەتی.

بەڵام کەسانێکی مالیکیی دەمارگیر دەڵێن لە تەمەنی ١٧ ساڵی بووە، تا بڵێن کەسێکی ناوازە بووە، هەرچۆن سکپڕییەکەی دایکی

سیٚ ساڵ بووه، به هه‌مان شێوه خوێندنه‌كه‌ی و فه‌توادانه‌كه‌شی ناوازه بووه.

له‌مه‌دا پشت به هه‌واڵێك ده‌به‌ستن كه گوایه (سوفیان بن عویه‌ینه) گێڕاویه‌ته‌وه كه له كۆڕی (ڕه‌بیعه) دانیشتووه، پرسیارێك هاتۆته پێشه‌وه، مالیكیش پرسیاره‌كه‌ی له (ڕه‌بیعه) كردووه، ئه‌ویش قسه‌یه‌كی پێوتووه سه‌رزه‌نشتی پێوه دیار بووه، بۆیه به توڕه‌یی ده‌ڕوات و له پشته‌وه به ته‌نها داده‌نیشێت، خه‌ڵكێك دێن و له‌لای داده‌نیشن، كه نوێژی مه‌غریب كرا، په‌نجا كه‌س یان زیاتر لێی كۆبونه‌وه، بۆ به‌یانی خه‌ڵكێكی زۆر لێی كۆبونه‌وه، ئه‌ویش بۆ خه‌ڵكه‌كه دانیشت، له‌وكاته‌دا ته‌مه‌نی ١٧ ساڵ بوو).

به‌ڵام ناتوانین ئه‌م هه‌واڵه به ڕاست وه‌رگرین، چونكه هه‌واڵه ڕاسته‌كان ده‌ڵێن به‌رله‌وه‌ی دانیشێت بۆ وانه‌وتنه‌وه و فه‌توادان، ڕاوێژی به مامۆستاكانی كردووه، به‌تایبه‌ت ناوی (ابن شهاب) و (ڕه‌بیعه)ی هێناوه، هه‌رچه‌ند پێمان وایه وازی له (ڕه‌بیعه) هێناوه، به‌ڵام یه‌كسه‌ر بۆ فه‌توادان دانه‌نیشتوه، وازهێنانه‌كه‌شی له‌به‌ر سه‌رزه‌نشت نه‌بووه، به‌ڵكو له‌به‌ر جیاڕایی نێوانیان بووه، ئه‌وه‌ش له ته‌مه‌نی حه‌ڤده‌ساڵی نه‌بووه.

به‌پێی هه‌واڵه ڕاسته‌كان حه‌وت ساڵ یان هه‌شت ساڵ لای (ابن هورمز) بووه، ئه‌مه‌ش هه‌روه‌ك باسمانكرد له دوای ئه‌وه بووه كه

باوكی پرسیاری لێكردوه و بەهەڵە وەڵامی داوەتەوە، ناكرێ لەو كاتەدا لە دەساڵان كەمتر بووبێت، چونكە لەوە كەمتر لەسەر هەڵە سەرزەنشت ناكرێت، كەواتە بەلای كەمەوە دەساڵان بووە، بەلای كەمەوە حەوت سالّیش لەگەڵ (ابن هورمز) بووە، ئەوە حەڤدە ساڵ، ئەی كەی جگە لای لەو خوێندویەتی، زێرینی پێمان دەڵێ كە دوای ئەوەش بەردەوام بووە لەسەر خوێندن.

بەپێی گێڕانەوە ڕاستەكان، بەر لە دانیشتنی بۆ فەتوادان، ڕاوێژی بە حەفتا لە مامۆستاكانی كردووە، هیچ ڕێی تێناچێت كە حەفتا مامۆستا كۆك بن لەسەر ڕێدان بە گەنجێكی حەڤدەساڵە، لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا فەتوا بدات، مەگەر كەسێكی ناوازەی شێوە موعجیزە بێت، بەڵام ئێمە لەو بڕوایەدا نین، چونكە ئەویش مرۆڤێك بووە و وەك هەموو كەسێك لەدایك بووە، ئەگەریش زانایەكی زۆر لێزان بووە، پێشەوای (دار الهجرە) بووە و لە سەردەمی خۆیدا هاوشانی نەبووە.

ئەگەریش بە دڵنیایی نەزانین لە تەمەنی چەند ساڵی دانیشتوە بۆ فێركردن، بەڵام دەتوانین بڵێین لە تەمەنی پێگەیشتندا بووە، هەواڵ زۆرە كە كاتێك دانیشتووە بۆ فەتوادان، (ڕەبیعە) لە ژیاندا بووە، لەكاتێكدا لەساڵی (١٣٦) ڕەبیعە كۆچی دوایی كردووە و مالیك بەپێی دروستترین گێڕانەوە لە ساڵی (٩٣) لەدایك بووە، كەواتە

لەکاتی کۆچی دوایی (ڕەبیعە)، تەمەنی مالیك (٤٣) ساڵ بووە، کەواتە ئاساییە کە بەر لەو کاتە بۆ فەتوادان دانیشتبێت.

ئەوەش گومانی لەسەر نییە کە مالیك لە خوێندن لای (ڕەبیعە) بەردەوام نەبووە، بەڵکو لەبەر جیاڕایی لەگەڵی و پێناخۆشبوونی هەندێك لە فەتواکانی بەجێی هێشتووە، هەرچەندە لە ڕێز و چاکەی کەم نەکردۆتەوە. نامۆش نییە کە لە ژیانی ئەودا کۆڕی خۆی هەبێت، چونکە هەردووکیان ڕای خۆیان هەیەو لێك جیاوازن و، مالیکیش گەیشتوەتە تەمەنێك بۆ فەتوادان و فێرکردن شیاوبێت. جیاڕایی نێوانیان ڕێگر نەبووە لەوەی لەکاتی دانیشتنی بۆ فەتوادان ڕاوێژی پێبکات، چونکە لەگەڵ جیاڕاییەکەیان دۆستایەتییان نەپچڕاوە.

کەواتە مالیك دوای پێگەیشتنی، لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا دانیشت بۆ فەتوادان و گێڕانەوەی فەرموودە، شوێنەکەشی هەمان ئەو شوێنە بوو کە عومەری کوڕی خەتاب لێی دادەنیشت بۆ ڕاوێژ و فەرمانڕەوایی و دادوەری، لە هەڵبژاردنی ئەم شوێنەدا کاریگەریی عومەری لەسەر بوو، هەروەك بە فەتواو داوەرییەکانیشی کاریگەر بوو، کە (ابن المسیب) و کەسانی دیکەی تابیعی گێڕاویانەتەوە. هەروەها ئەو شوێنە شوێنی دانیشتنی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بووە.

بۆ نیشتەجێبوونیش، لە خانوی (عبدالله کوڕی مەسعود) نیشتەجێ بوو، هەروەك لە (المدارك) هاتووە: ئەو خانووەی (مالیك بن أنس) لە مەدینە تێیدا دەمایەوە، خانوەکەی (عبدالله کوڕی مەسعود) بوو، تا شوێنپێی ئەویش هەڵگرێت.

مالیك بە شوێنەواری هاوەڵان و تابیعیەکان دەورە درابوو، بەوردی فەتوای هاوەڵانی لە تابیعییەکان وەردەگرت، بەتایبەتی ئەوانەی خاوەن ڕەئی بوون، بەدوای هەواڵی عومەر و ابن مسعود و هاوەڵە فەقیهەکانی دیکەدا دەگەڕا، داوەری و حوکمەکانیانی وەردەگرت، لە لێکۆڵینەوەکانی سوربوو لەسەر ئەوەی شوێنکەوتە بێ نەك بیدعە دابهێنێ، کردار و کێشانە و پێوانە و هەواڵەکانی خەڵکی مەدینە لای ئەو ڕووناکییەك بوو ڕێی فەقیهی ڕۆشن دەکردەوە، لەسەر ڕێڕەوی ئەوان دەڕۆشت.

مالیك بەدرێژایی ژیانی لە مزگەوت نەمایەوە، بەڵکو گواستییەوە بۆماڵەکەی خۆی، ئەمەش کاتێك تووشی نەخۆشی (میزەچرکە) بوو، بەپێی هەندێك گێڕانەوە، بەڵام هەموان کۆڕان لەسەر ئەوەی لەبەر نەخۆشی بووە. لەخەڵك دابڕا، ئەگەرچی لە زانست و فەرموودە و وانە وتنەوە و فەتوادان دانەبڕا، تا ئەوساتەی گیانی سپارد.

لە (دیباج المذهب)ـی (ابن فرحون) هاتووە کە (واقدی) وتوویەتی: مالیك دەهات بۆ مزگەوت و ئامادەی نوێژەکان و هەینی و

جەنازەکان دەبوو، نەخۆشەکانی بەسەر دەکردەوە، مافەکانی دەگەڕاندەوە، لە مزگەوت دادەنیشت و هاوەڵانی لێی کۆدەبونەوە، پاشان وازی لە دانیشتنی مزگەوت هێنا، تەنها نوێژی دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، وازی لە ئامادەبوونی جەنازە هێنا، تەنها دەچووە لای خاوەن جەنازەکان و سەرخۆشی لێ دەکردن، پاشان وازی لە هەموو ئەوانە هێنا، ئامادەی نوێژەکانی مزگەوت و هەتا هەینیش نەدەبوو، نەدەچووە لای کەس بۆ سەرخۆشی، لەخەڵك دابڕا تا کۆچی دوایی کرد، دیارە پرسیاری لێکراوە لەوبارەیەوە، بۆیە دەیوت: (هەموو کەس ناتوانێت بیانوەکەی باس بکات).

تا لە ڕۆژی کۆچی دواییەکەی وتی: ئەگەر دوایین ڕۆژم نەبوایە پێم نەدەوتن، کە نەخۆشییەکەم (میزەچرکە)یە، پێم خۆش نەبوو بەبێ دەستنوێژ بێمە مزگەوتی پێغەمبەری خوا، پێشم ناخۆش بوو باسی دەردەکەم بکەم و بەوەش سکاڵا لە پەروەردگارم بکەم.

خوای گەورە تەمەنی درێژ کرد تا گەیشتە نزیك نەوەد ساڵ، بەپێی زۆرترین گێڕانەوەکان ساڵی (١٧٩) کۆچی دوایی کردووە، (قاضي عیاض) وتویەتی: ئەمەیان دروستە و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن، بەڵام لە ڕۆژەکەی جیاڕان، زۆربە پێیان وایە لە شەوی (١٤)ی ڕەبیعی دووەم بووە.

## بژێوی ژیانی و پەیوەندیی بە دەسەڵاتدارانەوە:

زانیمان کە هەر لە منداڵییەوە ڕووی کردۆتە زانست، بۆیە بواری کارکردنی نەبووە، هیچ هەواڵێك نییە کە لەپاڵ خوێندن کارێکی کردبێت.

لە کتێبەکاندا بینیمان کە (نضر)ی برای بازرگانی قوماش بووە، مالیکیش لەگەڵی بازرگانی کردووە. بازرگانی و وەرگرتنی زانست پێکەوە ئاساییە، چونکە کارەکان لەڕێی بریکارەکانەوە دەکرێن. کەواتە ئەوە پێش دەخەین کە کاری بازرگانیی کردووە، هەروەك لە کتێبە هەواڵیەکاندا هاتووە، ئەوەتا (ابن القاسم)ی قوتابیی مالیك دەڵێت: کە مالیك چوارسەد دیناری هەبوو بازرگانی پێوەدەکرد، بژێوی ژیانی لەسەر ئەوەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، مالیك دیاریی خەلیفەکانی وەردەگرت و لێی بەگومان نەبوو، بەڵام لە دیاریی خوار ئەوانە خۆی بەدوور دەگرت، لەوبارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتی: لە خەلیفەکان هیچ گومانی تێدا نییە، واتە ئاساییە وەری بگریت، بەڵام خوار ئەوان شتێکی تێدایە.

وادیارە پێی وابووە ئەوانەی خوار خەلیفە هەندێك جار بەشێك لەوەی کۆی دەکەنەوە بۆخۆیان لادەدەن، بۆیە دەروونی ڕێی نەدەدا دیاری و بەخششی ئەوان وەرگرێت.

دەگێڕنەوە کە (رەشید) سێ هەزار دیناری بۆ بڕیەوە، پێی وترا ئەی (أبو عبدالله) سێ هەزار لە ئەمیری باوەڕداران وەردەگریت؟!
وتی: ئەگەر پێشەوا دادوەر بێت و، بزانێت هاوکاریی کێ دەکات، هیچی تیا نابینم.

کە دیاریی وەردەگرت بۆ پاراستنی کەسایەتی خۆی بوو، تا پێویستییەکانی خۆی پێ دابین بکات و دالّدەی قوتابییە هەژارەکان بدات و پێویستی نەداران دابین بکات. لەگەڵ ئەو نیازە چاکەیشی، ڕێگریی دەکرد کەسانی دیکە دیاریی دەسەڵات وەربگرن، ئەوەك هەمان نیازیان نەبێت.

لەسەرەتای ژیانیدا زۆر دەستکورت بووە، هەتا هەندێك جار کچەکەی لە برسان دەگریا. دەگێڕنەوە کە ئامۆژگاریی (جەعفەری مەنصور)ی کردووە لەبارەی ئاگاداربوونی ژێردەستەکانی، ئەویش وتوویەتی: ئایا کاتێك کچەکەت دەگریا، فەرمانت نەکرد دەستاڕەکە بجولّێنن تا دراوسێکان نەیبیستن؟ مالیك وتی: کەس ئەمەی نەزانیوە خوا نەبێ. وتی: جا من ئەوەم زانی، چۆن بارودۆخی ژێردەستەکانم نازانم.

بەگشتی مالیك دەستکورتی و نەبوونی و، ژیانی خۆشی و دەوڵەمەندی بینیوە، لە هەردوو دۆخیشدا هەر سوپاسی خوای

کردووە، هەواڵی زۆر لەبارەی دەستکورتی و زۆریش لەبارەی دەوڵەمەندییەکەی هەیە، بۆیە (قاضي عياض) لەو بارەوە دەڵێت: (ئەو هەواڵە زۆرە جۆراوجۆرانە لەبەر جیاوازیی کاتەکان و گۆڕانی دۆخەکان بووە، لەسەرەتا وەك کۆتایی نەبووە، مالیك نزیکەی نەوەد ساڵ وەك پێشەوا ژیاوە و فەرموودەی گێڕاوەتەوە و فەتوای داوە، نزیکەی حەفتا ساڵ قسە وەرگیراو بووە، بەرەبەرە مەزنتر بووە و پایەدارتر بووە و دەسەڵاتی زیاتر بووە، هەتا کاتێك کۆچی دوایی کرد، چەندین ساڵ بوو لە دونیا و دیندا سەرۆکایەتی بێ هاوتای هەبوو، بۆیە هەواڵە جۆراوجۆرەکان لەبارەیەوە دژ یەك نین).

مالیك دوای دەوڵەمەند بوونی، شوێنەواری نیعمەتەکانی خوا لە هەموو ژیانی دەرکەوت، لە خواردن و پۆشاك و خانووەکەی، دەیوت: پێم خۆش نییە کەسێك خوا نیعمەتی پێبدات، شوێنەواری نیعمەتەکە پێیەوە دیار نەبێت، بەتایبەتی زانایان. هەروەها دەیوت: پێم خۆشە خوێنەر پۆشاکی سپی بێت.

گرنگیدانی مالیك بە خواردن تەنها بۆ چێژبینین نەبوو، ئەگەرچی ئەوە تاوان نییە، بەڵکو بۆ ئەوەی بوو بیرکردنەوەی دروست بێت، توانای وەرگرتنی زانیاریی زیاتر بێت، زیاتر بەرگە بگرێت، لەبەردەم خەڵك لاواز و بێتوانا و ماندوو دەرنەکەوێت، وەك هەندێك لە زاهیدان لەبەر تێنەگەیشتن لە کرۆکی ئیسلام وا دەکەن.

زاهیدی زاهیدان محمد (صلی الله علیه وسلم) خۆشترین خواردنی هەڵدەبژارد، بەبێ ئەوەی سوور بووبن لەسەر داواکردنی و حەزکردن بە بەدەستهێنانی.

گرنگیدانی مالیك بە پۆشاك و خانوەکەیشی، لەپێناو ڕوح بووە نەك ماددە، هانی زانستخوازانی دەدا کە بایەخ بە پۆشاکەکانیان بدەن، چونکە ئەوە بێگەردی و ئارامی و ئاسودەیی لە دەرووندا دروست دەکات، وا دەکات بیرکردنەوەت بەئاراستەیەك، بڕوات کە نارێکی و شڵەژانی تێدا نییە.

گرنگیدان بە پۆشاك و خانوو، بەرزی لە دەرووندا گەشە پێدەدات و لە سەرشۆڕی و خۆبەکەمزانی لەبەرامبەر خەڵك دووری دەخاتەوە.

مالیك لە وانەوتنەوەدا زۆر هێمن و بە هەیبەت بوو، دووربوو لە قسەی زیادە و ناپێویست، پێی وابوو ئەمانە بۆ زانستخوازان پێویستن، دەگێڕنەوە کە ئامۆژگاریی منداڵێکی براکەی کردووە و پێی وتووە: فێری ئەو زانستە ببە کە فێری ئارامی و نەرم و نیانی و هەیبەتی کردووە.

زۆرجار دەیگووت: زانستخواز دەبێ هەیبەت و ئارامی و سامێکی تێدابێ، شوێنپێی پێشینەکان هەڵگرێت، دەبێ دەروونیان لە گاڵتە پاك بکەنەوە، بەتایبەتی لەکاتی باسکردنی زانستدا. هەروەها

دەیگووت: یەکێك لە ئەدەبەکانی زانا ئەوەیە کە پێنەکەنێت تەنها بە خەندە نەبێت.

خۆیشی زۆر بەتوندی پابەندی ئەم ئادابانە بوو، ئەوەندە وانەی دەگووتەوە و نزیکەی پەنجا ساڵ فەرموودەی دەگێڕایەوە، نەبینراوە پێبکەنێت، جارێك یان دوان یان لەو نزیکانە نەبێت.

ئەمانەی لەبەر دڵڕەقی یان توند ڕەفتاری نەبووە، بەڵکو وەك ڕێزێك بۆ مامۆستا و فەرمووده خۆی لەسەر ئەمە ڕادەهێنا، یەك لە قوتابیانی دەڵێت: مالیك کە لەگەڵمان دادەنیشت، وەك ئەوەبوو یەکێك بێ لەخۆمان، بەسادەیی قسەی لەگەڵمان دەکرد، لەئێمە خاکیتر بوو، هەرکە فەرموودەیەکی بگێڕایەتەوە، قسەکانی هەیبەتی پێوە دیار بوو، وەك ئەوەی نەماننناسێت و نەیناسین.

ئەو هەیبەتە بەدرێژایی ماوەی وانەوتنەوەکانی بەردەوام بوو، هەندێك هاوسەردەمانی دەڵێن: لەساڵی (١٤٤) چوومە مەدینە، مالیك سەر و ڕیشی ڕەش بوو، خەڵك بەبێدەنگی لەدەوری بوون، لەبەر هەیبەتی ئەو کەس قسەی نەدەکرد.

هەرچەندە هەموو کات مالیك لەوانەکانیدا ڕێکوپێك و جوان بووە، چ لەکاتی فەتوادان، یان گێڕانەوەی فەرموودە، لەکاتی گێڕانەوە لە پێغەمبەرەوە، خۆی زیاتر ڕێکدەخست و دیمەنێکی جوانتری بەخۆی دەدا، هەرکات فەرموودەی بگێڕایەتەوە، دەستنوێژی دەشوشت و

خۆی ئامادە دەکرد، چاکترین پۆشاکەکانی دەپۆشی، تەنها لەکاتی گێڕانەوەی فەرموودەدا لەسەر سەکۆکە دادەنیشت.

(مطرف)ی قوتابیی باسی حاڵی مالیك دەکات دوای ئەوەی وانەوتنەوەی گواستنەوە بۆ ماڵەکەی و، دەڵێت: هەرکات خەڵکێك بهاتنایە بۆ لای، خزمەتکارەکەی دەردەچوو دەیوت: شێخ دەڵێ فەرموودەتان دەوێ یان پرسیارتان هەیە؟ ئەگەر بیانوتایە پرسیارمان هەیە، دەهات بۆلایان و فەتوای بۆ دەدان، ئەگەریش بیانوتایە فەرموودەمان دەوێ، دەیوت دانیشن، دەچوو خۆی دەشۆری، بۆنی خۆشی لەخۆی دەدا، پۆشاکی تازەی دەپۆشی، مەندیلی دەبەست و سەکۆیەکی بۆ دادەنرا، ئینجا بەملکەچییەوە دەچوو بۆ لایان، هەر بۆنی بەسەردا دەکرا تا لە فەرموودەکان تەواو دەبوو.

ئەو شێوازەی وایکرد خوای گەورە بەرەکەت بخاتە تەمەنیەوە و، ژیریی و بەرچاوڕوونی پێ ببەخشێت، هەرچەند زیاتر بەنێو ساڵدا بچوایە، تێگەیشتن و دەرککردنی زیادی دەکرد، لای خەڵك بەڕێزتر دەبوو، لە ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوای وڵاتانی ئیسلامی دەنگی دابویەوە، زانایان و قوتابیان سەردانیان دەکرد بۆ بیستنی فەرموودە و وەرگرتنی فەتوا لەو بابەتانەی ڕوودەدەن، ئەویش حوکمەکەی بۆ ڕوون دەکردنەوە، بنچینەکەیشی لە شەریعەت بۆ دەخستنەڕوو، چین

چین خەڵك دەهاتنە بەردەرگای، بەتایبەتی لە وەرزی حەجدا، لەبەر ئەو جەنجاڵییە دەرگاوانی هەبوو، قوتابی و مریدەکانی دەبوونە پاسەوان وەك پۆلیس، بەڵکو دەڵێن زیندانیی هەبووە، هەرکەسێك نەشازی بکردبایە یان ڕێ ڕاستەکەی بکردایەتە مایەی پێکەنین، زیندانیی دەکرد، ئەگەر گوێی لێبوایە کەسێك فەرموودەیەك وەك خۆی ناگێڕێتەوە، زیندانیی دەکرد، ئەگەر تکایان بۆ بکردبایە، دەیوت: با ئەوەی دەیوت ڕاستی بکاتەوە، دەردەچێت.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ دوو خاڵ بدەین لەبارەی وانەوتنەوەی ئیمام مالیك:

١- وەڵامی شتێکی دەدایەوە کە ڕوویدابێت، ئەوەی ڕووینەدابێت گریمانەی بۆ دانەدەنا، قوتابیەکانی هەوڵیان دەدا وەڵامی هەندێك شتیان بداتەوە کە ڕووینەداوە، بەگوێی نەدەکردن، بەڵکو لە سنوری ئەو واقیعە دەوەستا کە موفتی لەسەریەتی بەپێی توانا حوکمەکەی بزانێت.

مالیك کە بەدوای گریمانە و ئەگەر نەدەکەوت، لەبەر دوو هۆ بوو:

یەکەمیان: ڕۆشتن لەگەڵ ئارەزووی عەقڵ لە گریمانە و ئەگەردا، وادەکات شوێن بیرکردنەوەی بەربەرەڵا بێت، عەقڵیش بەبێ بەڵگە

بەرەو لادانت لە هەندێك شوێنەوارت دەبات بەبێ بەڵگە، وادەكات بەبێ زانیاری یان بەڵگە لە قورئان و فەرموودە فەتوا بدەیت.

دووەمیان: فەتوا تاقیكردنەوەیە بۆ زاناكە، دەبێ تەنها لە ڕێنمایی خەڵك لە كارەكانیاندا پێی هەڵسێت و وابكات لە بازنەی ئایینە پاكەكە دەرنەچن.

هەتا لەو بابەتانەش كە ڕوویانداوە زۆر وریا بوو تا هەڵە نەكات، بۆیە كەم وەڵامی پرسیاری دەدایەوە و نەك زۆر، چونكە دەیزانی ئەم زانستە دینە، نابێ بەبێ بەڵگە لە دینی خوادا قسە بكات، وەڵامەكەی بە (ما شاء الله، لا قوة إلا بالله) دەست پێدەكرد و زۆرجاران دەیوت: نازانم، زۆرجاریش لەدوای فەتواكەی دەیوت: گومانی ئێمە ئاوایە و تەواو دڵنیا نیم.

(عبدالرحمن بن مهدی) دەڵێت: پیاوێك پرسیارێكی لە مالیك كرد، پێی وت كە لە مەغریبەوە شەش مانگە بەڕێوەیە، ئەویش وتی: بەو كەسە بڵێ كە تۆی ناردووە، كە من هیچی لەبارەوە نازانم. وتی: ئەی كێ دەیزانی؟ وتی: ئەوەی خوا فێری كردووە.

٢- باسمان كرد كە مالیك ئەو فەرموودانەی وەری دەگرتن، دەینووسینەوە، سەرەڕای ئەوەی كە لەبەری دەكردن، لەبەركردن

خۆراکی مێشکه و، بیرکردنەوە هەزمکردنی ئەوانەیە کە عەقڵ قبوڵی دەکات، بەڵام نوسینەوەی بۆ ئەوەیە لێی تێکەڵ نەبێت.

بە هەمان شێوە هانی هاوەڵانی دەدا کە لەگەڵ فەرموودە بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن، فەرموودەی دەنوسیەوە و بەسەریاندا بڵاوی دەکردەوە، بە ئامادەبوونی خۆی دەیانخوێندەوە، ئەگەر هەڵەی بکردبایە ڕایدەگرت و بۆی ڕاست دەکردەوە، چونکە نووسینەوە و خوێندەوەی بۆی، بۆ خۆدوورگرتنی ڕاوییە لە دروستبوونی گومان لە بێژە یان مانایەکدا.

بەڵام سەبارەت بە تۆمارکردنی فەتواکانی خۆی، هەواڵەکان ئەوە دەگەیەنن کە هانی هاوەڵانی نەداوە بینوسنەوە، ئەگەریش ڕێی لێ نەگرتوون، بەڵام هەندێك جار ناڕەزایی دەردەبڕی لەوەی هەموو شتێکی لێوە بنووسن.

یەکێك لە قوتابیەکانی بەناوی (مەعن) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (گوێم لێبوو مالیك دەیگووت منیش مرۆڤم هەڵە دەکەم و پەشیمان دەبمەوە، کەچی هەموو ئەوەی دەیڵێن دەنوسرێت!!).

(أشهب) دەڵێت: (بینی کە وەڵامی ئەو بۆ پرسیارێك دەنووسمەوە، وتی مەینووسەوە، من نازانم لەسەر ئەوە دەمێنمەوە یان نا).

لەکۆی ئەو هەواڵانە دەردەکەوێت کە ئەو نەیدەویست هەموو فەتوایەکی بنووسرێتەوە، لەترسی ئەوەی لە هەندێکیان پەشیمان بێتەوە، ئەگەر لەبارەی بابەتێك فتوای بدایە و تەواو دڵنیابووایە، پشت بەست بە دەقێکی یەکلاکەرەوە لەبارەیەوە، یان فەرموودەیەکی ڕاشکاو لە حوکمەکەی، ڕێگریی نەدەکرد لە نووسینەوەی، بەڵام ئەگەر فتوای لە بابەتێك بدایە و فتواکەی لەسەر بناغەی گومانێك بوایە، کە ئەو تەرجیحی داوە، نەك یەقین، ڕێگریی دەکرد لە نووسینەوەی.

***

## پەیوەندیی مالیك لەگەڵ خەلیفە و والییەکان

مالیك لە تەمەنی خۆی (٩٣-١٧٩ك)، دوو دەوڵەتی ئیسلامی (ئومەوی و عەباسی) بینیوە، لەو سەردەمەدا ڕووبەری ئیسلام فراوان بوو، حوکمەکانی لە وڵاتانێکی فراوان جێگیر بوو، کە ڕۆژی لێ ئاوا نەدەبوو، حوکمی ئیسلام لە ڕۆژهەڵات گەیشتە چین، لە ڕۆژئاوا گەیشتە ناوەڕاستی ئەوروپا و دەریای تاریکییەکان، هەردوو دەوڵەتەکە بەناوی خیلافە حوکمیان دەکرد، بەڵام پاشایەتی بوو، خیلافە بریتییە لە ڕاوێژ لەنێوان مسوڵمانان، بەڵام پاشایەتی بەتوندی دەستی پێوە دەگیرێت و نەوە لە باوانەوە بۆی دەمێنێتەوە، کێشەی زۆر و خوێناوی لەنێوان پادشاکاندا ڕوویدا.

مالیك تەنها ئەم جۆرە حوکمەی بینی، ئەگەر کەسێك بیەوێت لە حوکمی ئەمانە دەرچێت، ئایا لەوان دادوەرتر هەیە؟ کەس هەیە لەوەیان کە کەمترین دادوەری و زۆرترین ستەمی هەیە، باشتر بێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا گێرەشێوێنی و تێکچوونی سیستەم، خراپەی زۆری لێ دەکەوێتەوەو پارێزراوەکان دەشکێنرێن، هەموو کەسێك دوچاری مەترسی دەبێتەوە، ئەو ستەمانەی لە ساتێکی گێرەشێوێنیدا ڕوودەدەن، لە ساڵانێکی ستەمی ڕێکخراودا ڕوونادەن.

ئەوەی لەو دۆخە نالەبارەدا بژێت، دەبێ بە واقیعی حاڵەکە ڕازی بێت، لەبەر ئەوە نا کە ئەو حوکمە نمونەییەیە کە ئیسلام بانگەشەی

بۆ دەکات، بەڵکو واقیعێکە، بە هەوڵدان بۆ لابردنی زیانی زۆری لێ دەکەوێتەوە و گەندەڵی فراوانتر دەبێت و، ئەنجامەکەش جێی دڵنیایی نیە، ئەزمونەکانیش ئەوە دەگەیەنن کە گۆڕانکاری بەرەو کەسانێك دەچێت کە ستەمکارترن و زیانیان زیاترە. ژیریش ئەگەر لەنێوان دوو زیاندا دوودڵ بوو، ئەوەیان هەڵدەبژێرێت کە زیان و خراپییەکەی کەمترە.

ئەو حاڵە بوو وایکرد مالیکی فەقیە سەقامگیری و ئاسودەیی پێ باشتر بێ تا خوای گەورە دەرویەك دەکاتەوە،﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ﴾ الرعد:١١. خۆتان چۆن بن، فەرمانڕەوای ئاواتان بۆ دێت.

هەر بۆیە مالیك ڕازی بوو کە بێدەنگ دانیشێت، ئەگەریش بێدەنگییەکە وەك دانپیانانی شەرعی نەبوو بەو دۆخەی تێیدایە، بەڵکو داننانە بەبوونی دۆخەکە و نەبوونی توانای گۆڕینی و، ڕازی نەبوون بە کرداری ئەوانەی هەوڵی گۆڕانکاری دەکەن، چونکە دەروونەکان نەگۆڕاون.

مالیك لەگەڵ کۆمەڵی مسوڵمانان مایەوە، دەرچوونی لە گوێڕایەڵیی پێ باش نەبوو، بانگەشەی شۆڕشی نەدەکرد و پشتگیریشی نەدەکرد، واباشە بڵێین بانگەشەی بۆ والی و خەلیفەکانی سەردەمی

خۆیشی نەکردوە و پشتگیریی نەکردوون، بەڵکو بێلایەن وەستاو بانگەشەی بۆ کەس نەکردووە، کە شۆڕشێك یان ئاژاوەیەك دروست دەبوو، ئەو لەگەڵ کۆمەڵی مسوڵمانان دەمایەوە و لە گوێڕایەڵی دەرنەدەچوو، پێی وانەبوو کە سیاسەتی دەسەڵاتی سەردەمەکەی هەقێکی تەواوە و لەگەڵ حوکمی ئیسلام و ڕێنمایی قورئان گونجاوە، بەڵکو چاکسازییەکی ڕێژەیی تێدا دەبینی، لەوانەیە چاکسازییەکە بە ئامۆژگاریی چاك و وتنی هەق و ڕێنمایی کردن بێت، چاکبوونی دەسەڵاتیش زۆربەی جار دوای چاکبوونی ژێردەستەکانی دەبێت، بۆیە زانایان لەسەریانە خەڵك چاك بکەن و ڕێنماییان بکەن، ئەگەر چاك بوون، دەسەڵاتی وەك خۆیان چاکیان بۆ دێت، بیرورای لەبارەی شێوازی چاکسازی هەر چۆنێك بووبێت، ئەو پشتیوانی کەس ناکات لەسەر ئاژاوە، چونکە هەردوولا لەسەر هەڵەن.

کاتێك پرسیاری لێکرا لەبارەی جەنگ دژی ئەوانەی لەخەلیفە هەڵگەڕاونەتەوە، وتیان: جائیزە لەگەڵیان بجەنگین؟ وتی: ئەگەر لە خەلیفەیەکی وەك (عومەری کوڕی عبدالعزیز) هەڵگەڕێنەوە، وتیان: ئەی ئەگەر وەك ئەو نەبوو، وتی: لێیان گەڕێن، خوا تۆڵە لە ستەمکار بە ستەمکار بسەنێتەوە، پاشانیش تۆڵە لە هەردوکیان بسەنێتەوە.

## ڕای مالیك لەبارەی ئیمامی عەلی

یەكێك لە عەلەوییەكان لە كۆڕێكیدا لە مالیك دەپرسێت: چاكترینی خەڵك دوای پێغەمبەری خوا، كێیە؟ وتی: ئەبوبەكر، وتی: دواتر؟ مالیك وتی: دواتر عومەر، وتی: دواتر كێ؟ وتی: ئەو خەلیفەی بە ستەم كوژرا، عوسمان.

(موصعەب)ی قوتابی دەگێڕێتەوە كە پرسیار لە مالیك كرا كە چاكترینی خەڵك دوای پێغەمبەری خوا، كێیە؟

وتی: ئەبوبەكر، وتی: دواتر؟ مالیك وتی: دواتر عومەر، وتی: دواتر كێ؟ وتی: عوسمان. وتیان: دواتر كێ؟ وتی: لێرە خەڵك وەك یەكن، ئەوانە چاكترین هاوەڵەكانی پێغەمبەر بوون، فەرمانی بە ئەبوبەكر كرد پێشنوێژی بكات، ئەبوبەكر عومەری هەڵبژارد، عومەریش شەش كەسی ڕاسپارد و ئەوانیش عوسمانیان هەڵبژارد، لێرەوە خەڵك وەستان.. لە گێڕانەوەیەكی دیكە هاتووە: ئەوەی داوای بەرپرسیارێتی بكات وەك ئەوە نییە كە داوای نەكردووە.

لە گێڕانەوەكی (ابن وەهب): چاكترینی خەڵك ئەبوبەكر و عومەر، وتم: دواتر كێیە؟ بێدەنگ بوو، وتم: من كەسێكم لە دینداریدا تۆم كردووە بە پێشەنگی خۆم، وتی: عوسمان.

لەو گێڕانەوانە دوو شت دەردەكەوێت:

یەکەمیان: لای مالیك ، ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان لە پایەیەکی سەرووی هەموو خەڵکن، ئەگەریش لە دوایین گێڕانەوە وا دەردەکەوێت کە لە دانانی عوسمان دوودڵ بووە.

دووەم: عەلی لەڕیزی هاوەڵانی دیکە دادەنێت و لە هیچدا لەوان باشتر نییە.

پێمان وا نییە کە مالیك پایەی عەلی نەزانیبێت، بەڵام کە پرسیاری لێکراوە، لەڕووی خەلیفایەتییەوە وەڵامی داوەتەوە، بۆ ئەوەش بیانوی خۆی هەیە:

١. لە دیدی ئەو، عەلی داوای خەلیفایەتی کردووە و هەوڵی بۆ داوە، ئەمەش وادەکات لەپایەی ئەوانەدا نەبێت کە داوایان نەکردووە.

٢. خەلیفایەتی ئەبوبەکر بە فەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، خەلیفایەتی عومەر بە هەڵبژاردنی ئەبوبەکر بووە، عوسمان لەلایەن شەش کەسەوە کە عومەر ڕایسپاردوون هەڵبژێردراوە، بەڵام عەلی لەلایەن بکوژانی عوسمان هەڵبژێردراوە.

٣. مالیك لە لێکۆڵینەوەی بابەتەکاندا واقیعی بووە، حوکمی لەسەر کارەکان داوە نەك شتی دیکە، سەردەمی خەلیفایەتی عەلی هەمووی جەنگ و ئاژاوە بووە.

هاوسەردەمانی تێبینی ئەوەیان کردووە کە فەرموودەی زۆری لە (عەلی و ابن عباس)ەوە نەگێڕاوەتەوە، هەروەك لە (شرح الموطأ)ی (الزرقانی) هاتووە:

(الرشید) بە مالیك دەڵێت: لە کتێبەکەت باسی عەلی و ابن عباس نابینین؟ وتی: لە شارەکەی من نەبوون و بە پیاوەکانیان نەگەیشتوون.

ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەوا مەبەستی باسکردنی زۆرە، ئەگەرنا لە (الموطأ) فەرموودە لەوانەوە هەیە.

پوختەی قسان ئەوەیە کە مالیك لەوانە بووە کە تێکەڵی سیاسەت نەبووە، هاندەری شۆڕشەکان نەبوە و لە ئاژاوەکان ڕازی نەبووە، لە ئامۆژگاریی کردنی والی و خەلیفەکان دریغی نەکردوە، بەخششی خەلیفەکانی وەرگرتووە، مەیلێکی تێدابووە بۆ ئومەوییەکان، بەڵام بە کردار یان گوفتار هیچی نەکردووە، ئەگەریش بەپێی ئەوانەی لێی دەگێڕنەوە ڕووکاری ڕایەکانی بەگشتی هاوڕای ئومەوییەکان بووە.

***

## مەینەتییەکانی

هەرچەند ئیمامی مالیك لە شۆڕشەکان بەدوور بوو و هاندەریشیان نەبوو، تێکەڵی ئاژاوەش نەدەبوو، بەڵام لە سەردەمی عەباسییەکان لە خەلیفایەتی (ئەبوجەعفەری مەنصور) دوچاری مەینەتی بووە، مێژوونووسان لەسەر ئەو مەینەتییانە هاوڕان، زۆربەیان دەڵێن لەساڵی ١٤٦ بووە، هەندێکیش دەڵێن ١٤٧ك.

لێرەدا سیان لەو هۆیانە باس دەکەین:

**هۆی یەکەم:** کە لەهەموویان لاوازترە، لەبارەی هاوسەرگیریی (متعە)، مالیك بەئاشکرا پێچەوانەی (ابن عباس)ی دەوت و بە حەرامی دادەنا، لە کتێبی (شذرات من الذهب) هاتووە کە بردیان بۆ بەغدا و پێی وت: چی دەڵێی لەبارەی هاوسەرگیریی موتعە، وتی: حەرامە، وتیان قسەی ابن عباس لەبارەیەوە هەیە، وتی: قسەی خەڵکی دیکە زیاتر لەگەڵ کتێبی خوادا یەك دەگرێتەوە، هەروەها سوربوو لەسەر حەرامکردنی، لەسەر پشتی گایەك بەپێچەوانە سوار کراو لەناو شاردا دەیانگێڕا، ئەویش پیسیی لە دەموچاوی لادەبرد و دەیوت: " ئەی خەڵکی بەغدا، ئەوەی نامناسێ، با بمناسێ، من (مالیك بن أنس)م، ئەمەم پێ دەکرێ تا بڵێم هاوسەرگیریی موتعە

جائيزه، ئەوەش نالێم". دوای ئەوە خوای گەورە زیاتر پایەداری کرد.

ئەم هەواڵە کەسانی متمانەدار نەیانگێڕاوەتەوە و پێچەوانەی ئەو هەواڵانەیە کە زۆر و بەناوبانگن، کە دەڵێ مالیك هەرگیز نەچوەتە بەغدا و وڵاتی حیجازی بەجێ نەهێشتووە.

هەروەها ناوەڕۆکەکەی مەعقول نییە، چونکە هەموو فەقیهەکان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی موتعە بەتاڵە، شیعە نەبێت. (أبو جەعفەر)یش لەوە ژیرترە فەقیهێکی پایەداری وەك مالیك لەسەر بابەتێکی زانراوی کۆڕای لەسەر بێت، سزا بدات، ئەو شیعەی بەو دڕکە دادەنا کە ئارامیی تێکدەدات، ناکرێت سزای مالیك بدات بۆ ڕاگەیاندنی دروستێتی ڕای ئەوان.

هۆی دووەم: بەهۆی پێشخستنی عوسمان بەسەر عەلیدا بووە، هەروەك لە (المدارك) هاتووە کە (ابن بکیر) وتویەتی: مالیك لەسەر پێشخستنی عوسمان بەسەر عەلیدا لێی دراوە، تالبییەکان هەوڵیان لەگەڵ دا تا لێیدرا، بە (ابن بکیر)یان وت: پێچەوانەی هاوەڵانت دەڵێیت، ئەوان دەڵێن بەهۆی بەیعەتەوە بووە، وتوویەتی: من لە هاوەڵانم چاکتر دەزانم.

ئەم هەواڵە لەگەڵ ئەوەی پێچەوانەی مەشهوورە، بەڵام لە ناوەڕۆکەکەی شتێکی تیایە پوچی دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە عەلەوییەکان لەو سەردەمەدا لای خەلیفە و والییەکانی بێزراو بوون، چونکە ساڵی مەینەتییەکان (ساڵی ١٤٦) دەکاتە دووەم ساڵی هەڵگەڕانەوەی (محمد ابن عبدالله النفس الزكيه) لە مەدینە و کوژرانی، ئەوسا تالبییەکان پێگەی وایان نەبوو، (ابوجەعفەر)یش لەو سەردەمەدا لەبەر ئەو جۆرە فەتوایە ئازاری فەقیهێك نادات.

هۆی سێیەم: ئەمەیان مەشهورە، کە فەرموودەی (ليس على المستكره كلاق)ی دەگێڕایەوە، ئاژاوەگێڕانیش ئەم فەرودەیان کردە بیانووی بەتاڵێتی بەیعەتی (ابوجەعفەری مەنصور)، ئەمەش لە سەردەمی هەڵگەڕانەوەی (محمد ابن عبدالله النفس الزكيه) لە مەدینە بڵاو بویەوە، (منصور) ڕێگریی کرد کە ئەو فەرموودەیە بگێڕێتەوە، پاشان لەلاوە کەسێکی نارد پرسیاری ئەوەی لێ بکات، ئەوەیش گێڕایەوە، بۆیە لێیدا. (ابن جرير)ی مێژوونووس وا گومانی بردوە کە مالیك بە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە، هانی خەڵك دەدات بۆ بەیعەت دان بە (محمد بن عبدالله)، وەك دەگێڕێتەوە کە مالیك فەتوای داوە بەیعەتی پێ بدەن، وتویانە بەیعەتی (مەنصور)مان لە ملە، وتویەتی: ئەو بەیعەتە بەزۆر بووە، زۆرلێکراویش بەیعەتی لەمل نییە، ئەوەبوو

خەڵك لەسەر قسەی مالیك بەیعەتیان دا بە (محمد بن عبدالله) و مالیك لە ماڵەكەی خۆی مایەوە.

پێمان وایە كە لێدانەكەی لەبەر گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە بووە، لەكاتێكدا (محمد بن عبدالله) لە مەدینە هەڵگەڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە نا كە بەو گێڕانەوەیە هانی خەڵك دەدات، بەڵكو پێمان وایە گێڕانەوەی ئەو فەرموودەیە و دەماودەم كردنی، وایكردوە كە خەڵك لەم فەرموودەیە ئەو ئاماژەیە وەربگرن كە بۆیان هەیە بەیعەتی (مەنصور) لەملیان لادەن بەو بیانوەی بەزۆر بووە، ئەوانەش كە خۆشییان لە مالیك نەدەهات، ئەوەیان كردە هەلێك بۆ ئەوەی گورزێكی لیّ بدەن، بۆیە هەواڵیان دایە والیی مەدینە، ئەوەبوو مەینەتییەكە ڕوویدا.

لە (الانتقاء)ی (ابن عبدالبر) هاتووە: كاتێك مالیك بانگ كرا و ڕاوێژی پێكرا و گوێی لێگیرا و قبولّ كرا، خەڵكێك نارەزاییان دەربڕی و ئیرەییان پیّ برد و بەهەموو خراپییەك ناویان برد، جا كاتێك (جەعفەر بن سلیمان) بووە والی مەدینە، چونە لای و زۆریان بۆ خوێند، گوایە بەیعەتەكەی ئێوە لای مالیك هیچ بەهایەكی نییە، چونكە ئەو كار بە فەرموودەیەك دەكات كە (ثابت بن أحنف) گێڕاویەتییەوە لەبارەی تەڵاقی زۆرلێكرا و كە جائیز نییە.

ئەمە ئاماژەیە کە هەندێك لەوانەی بە پێگەی بەرزی مالیك نیگەران بوون و لێی بەفێڵ بوون، بۆیە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیان بە هەڵگەڕانەوەی مالیك داناوە.

لای من هۆی مەینەتییەکە تەنها گێڕانەوەی ئەو فەرموودە نەبووە، بەڵکو گێڕانەوەیەتی لەکاتی ئاژاوەکاندا و، بەکارهێنانی لەلایەن هەڵگەڕاوەکانەوە بۆ هاندانی خەڵك بۆ هەڵگەڕانەوە، لەمەشدا پێگەی زانستی و فەتوادانی مالیکیان بەکارهێناوە، ئەوانەش کە لە مالیك بەقین بوون، ئەمەیان کردە بیانویەك تا گورزێکی لێبدەن، ئەوەبوو ڕێگریی لە مالیك کرا لە گێڕانەوەی، بەڵام بەقسەی نەکردن.

ئەم هۆیەیان لەگەڵ قسەی زۆرینە گونجاوە، هەروەها لەگەڵ ئەوانەشدا دەگونجێت کە مالیك پێی ناسراوە، کە بەشداریی ئاژاوەی نەکردوە و هانی هەڵگەڕانەوەی نەداوە، لە هەمان کاتدا بۆ ڕەزامەندی کەس بێدەنگ نەبووە، چونکە پێی وابووە بێدەنگ بوون شاردنەوەی زانستە، خوای گەورەش نەهیی کردووە لە شاردنەوەی زانست، هانی قوتابییەکانی دەدا کە زانست بڵاو بکەنەوە و نەیشارنەوە، هەروەك لە (المدارك) و جێی دیکەش هاتووە.

سەبارەت بە گێڕانەوەی ئەو فەرموودەیەش، دیدی ئەو و دیدی والییەکان جیاواز بووە، ئەبوجەعفەر و والییەکانی پێیان وابووە کە گێڕانەوەی ئاژاوەی لێ دەکەوێتەوە، یان هاندانی ئاژاوەیە و

بانگەشەکارانی ئاژاوە بەکاریان هێناوە، لە دیدی مالیکیش گێڕانەوەی بریتییە لە بڵاوکردنەوەی زانست، ئیتر لەدوای ئەوە گوێ بەهیچ نادات، هەروەك چۆن وانەوتنەوەکانی لەوە دوور بووە کە گەرای ئاژاوەی تیا بتروکێت، بە هەمان شێوە خۆیشی بەدوور گرتووە لەوەی گێڕانەوەی فەرموودە دوابخات، یان ملکەچ بکات و بۆ ڕەزامەندی دەسەڵات زانستەکە بشارێتەوە.

سەبارەت بەوەی کە (ابن جرير الطبري) ڕایگەیاندووە گوایە فەتوای داوە بە بەیعەتدان بە (محمد بن عبدالله)، کە لەپێشەوە باسمان کرد، پێمان وایە ئەم تێگەیشتنەی لە گێڕانەوەی ئەو فەرموودەیەوە وەرگرتووە، یان لەوانەیە لە تەخریجی فەرموودەکەدا وتبێتی هەر بەیعەتێك یان سوێندێك بە زۆرلێکردن بێت، بەتاڵە. ئەوەش مانای بەتاڵێتی بەیعەتی مەنصور و جائیزبوونی بەیعەت دان بە کەسێکی دیکە دەگەیەنێت.

بەڵام وەك (ابن جرير) وتوویەتی: مالیك لە ماڵەکەی خۆی ماوەتەوە و لە خەڵك دابڕاوە، تا بەشداریی ئاژاوە نەکات.

پوختەی قسان ئەوەیە کە هۆی مەینەتییەکانی لە سەردەمی هەڵگەڕانەوەی (محمد بن عبدالله) بووە، کە هەڵگەڕاوەکان فەرموودەکەیان بەکارهێناوە و، ناحەزانیش تەڵەیان بۆ مالیك

ناوەتەوە، بۆیە مەینەتییەکانی مالیك لەساڵی ١٤٦ بووە، دوای کوژرانی محمد لە ١٤٥.

زۆرینە پێیان وایە کە (جەعفەر بن سلیمان)ی والی مەدینە سزای داوە، بەپێی هەواڵەکانی لە کتێبی (المدارك) هاتوون، لەخۆیەوە بەبێ ئاگاداریی ئەبوجەعفەر ئەمەی کردووە، چونکە ئەوە لەدوای ئاژاوەکان بووە، دوای ئەوەی ڕیشەکێش کرا. (عبدالبر) لە (الانتقاء) دەڵێ کە ئەبوجەعفەر خۆی ڕێگریی لێکردوە ئەو فەرموودەیە بگێڕێتەوە و دواتر لەولاوە کەسێکی ناردووە گوێی بۆ بگرێت، ئەوەبوو بینی کە دەیگێڕێتەوە.

بەڵام ناتوانین بڵێین مەنصور زانیاریی لەبارەوە نەبوە و پێی ڕازی نەبووە، چونکە هەتا دەیزانی چی لە ماڵی مالیك ڕوودەدات، دەیزانی کە فەرمان بە خزمەتکارەکەی دەکات دەستاڕەکە بجوڵێنێت، تا دراوسێکان گریانی کچەکەی نەبیستن کە لەبرسان دەگری، بەڵام سیاسەت وادەکات هەندێك کەس تاوانی کارێك هەڵگرێت و ئەوانەش کە بەسەریاندا زاڵن بێ تاوان دەرچن.

وادیارە خەڵکی مەدینەش کە بینییان ئاوایان بەسەر فەقیە و ئیمامەکەیان هێناوە، ڕقیان لە بەنی عەباس و والیەکانییان هەڵگرت، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی ئیمامی مالیك ستەملێکراو بوو، هانی ئاژاوەی نەدەدا، سەرکەشی نەدەکرد، لە سنوری فەتوادان

تێنەدەپەڕی، پێش و پاش ئازاردانەکەی لە ڕێڕەوی خۆی لای نەدا، لەسەر وانە وتنەوە بەردەوام بوو، هانی کەسی نەدەدا بۆ گەندەڵی و خراپەکاری، ئەمانە وایکرد زیاتر ڕقیان لە فەرمانڕەواکان بێت، وایان لێکردن تاڵی کردەوەکانیان بچێژن، بەتایبەتی (ابوجەعفەر)ی فێڵباز، ئەگەریش لەڕوکاردا ئەو فەرمانی نەدابوو، هەربۆیە کە هاتە حیجاز بۆ حەجکردن، کەسێکی نارد بەدوای مالیك دا بە مەبەستی داوای لێبووردن.

ئیمامی مالیك خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: " کە چووم بۆ لای (ابوجەعفەر)، لەبەر ئەوەی داوای لێکردبووم لە وەرزی حەجدا سەردانی بکەم، پێی وتم: سوێند بە خوای تاك فەرمانم بەوە نەکردووە کە ڕوویدا، نەشمزانیوە، هەتا تۆ لەنێو خەڵکی دووحەرەمەکەدا بیت، ئەوان سەلامەتن، پێم وایە تۆ مایەی دڵنیاییت بۆ ئەوان، بەهۆی تۆوە خوای گەورە بەڵایەکی گەورەی لەسەر هەڵگرتن، ئەوان لە هەموو خەڵك زیاتر بەرەو ئاژاوە دەچن، بەخوا فەرمانم کرد لەسەر پشتی حوشتر لە مەدینەوە بیهێنن بۆ عێراق، فەرمانم کرد لە شوێنێکی تەنگ زیندانی بکرێت و چەندی کرا سوك بکرێت، دەبێ چەند هەندەی مالیك سزای بدەم.

منیش وتم: خوا ئەمیری بڕواداران سەلامەت بکاو پایەداری بکات، من لێی خۆش بووم لەبەر خزمایەتییەکەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا و، لەگەڵ تۆ. وتی: دەك خوا لێت خۆش بێت".

ئەم گێڕانەوەیە ئاماژەیە کە مەزنی لێبوردەیی مالیك دەردەخات، هەروەها دەریدەخات کە (ابوجەعفەر) داوای لێبوردنی زۆری کردووە، دەیزانی مالیك لە چ ئاستێکە و کاریگەریی چەندە لەسەر دەروونی خەڵکی حیجاز، بۆی دەرکەوتووە کە ئەو هاتنی ئاژاوە نادات و بانگەشەی بۆ ناکات، هەربۆیە بە مایەی دڵنیایی خەڵکی حیجازی داناوە، چونکە ئەگەر مالیك نەبوایە، لە هەموو خەڵك خێراتر بەرەو ئاژاوە دەچوون.

***

## ئامۆژگاری و ڕاسپاردەی مالیك بۆ خەلیفەکان:

مالیك پێی وانەبوو کە حوکمی خەلیفەکانی هاوسەردەمی حوکمی ئیسلامە، بەڵام هەڵگەڕانەوەی بە جائیز نەزانیوە، چونکە نائومێد بووە لەوەی چاکسازی لەڕێی هەڵگەڕانەوە بکرێت، چونکە ئەو ئاژاوانەی بیستویەتی و بینیویەتی، دۆخەکەی لە گەندەڵییەوە بەرەو چاکسازی نەبرد، بەڵکو بەرەو خراپتری دەبرد.

لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیی لەگەڵ خەلیفە و ئەمیرەکان نەپچڕاند، بەڵکو پێی وابوو کە پێویستە لەسەری ڕێنمونییان بکات و چاکیان بکان، چونکە پیاو تەماشای واقیعی کاروبارەکان دەکات، تەنها لەلای وێنە نمونەییەکان نامێنێتەوە، هەستی دەکرد کە ئامۆژگاریی ئەوانە، هەندێك لەوانە لادەبات کە تێی دەکەون و خراپەیان کەمتر دەکاتەوە و، لەوانەیە هانیان بدات بۆ چاکسازیی تەواو، هەروەك چۆن نمونەی (عمر بن عبدالعزیز) تیایان دەرکەوت.

لەبەر ئەمانە دەچوو بۆ لای ئەمیر و خەلیفەکان و، ئامۆژگاریی و ڕێنمایی دەکردن و، بەرەو چاکە بانگی دەکردن، هەتا لە دیدی خەڵك گەورەتر بوایە، زیاتر حەزی بە ئامۆژگاری دەکرد، هانی زانایانیشی دەدا بۆ ڕێنمایی خەلیفە و ئەمیرەکان و، وتنی هەق پێیان بەپێی توانا.

دەیوت: هەر مسوڵمانێك یان کەسێك، خوای گەورە زانست و شارەزاییەکی لە سینەیا داناوە، لەسەری پێویستە بچێتە لای دەسەڵاتدار و فەرمانی چاکەی پێ بکات و ڕێگری خراپەی لێ بکات، هەتا چونی زانا لەوانی دیکە جیابکرێتەوە، ئەوەش فەزڵێکە هاوتای نییە.

قوتابییەکانی پێیان وت: خەڵك دەڵێن کە تۆ زیاد لە پێویست دەچیت بۆ لای ئەمیرەکان، وتی: ئەوە دەروونم هانم دەدات بۆی، چونکە لەوانەیە کەسێکی نەشیاو ڕاوێژی پێ بکرێت.

جا هەندێك ئامۆژگاریی هەبوو بە خەلیفەکانی دەوت، کاتێك لە وەرزی حەجدا دەهاتن بۆ حیجاز، لەوانە بە (هارون الرشید)ی وت:

بیستومە کە (عمر بن الخطاب) چاکە و پێشینەی خۆی هەبووە، فووی لە خەڵوزی بن مەنجەڵ کردووە بۆیان، تا دوکەڵ لە ڕیشی دەرچووە، بەڵام خەڵك بەبێ ئەوەش لە ئێوە ڕازی بووە.

بە هەندێك لە والییەکانی وتوە: چاودێریی لە کاروباری ژێردەستەکانتدا بکە، چونکە تۆ بەرپرسی لەوان، (عمر بن الخطاب) دەیوت: بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر وشترێك لە کەنارێکی فورات لەناوبچێت، وا گومان دەبەم کە خوا ڕۆژی قیامەت لەبارەیەوە پرسیارم لێ بکات.

(ابوجەعفەر) داوای لێدەکرد ڕای خۆی بڵێت لەبارەی والییەکانی حیجاز و، پێی وت: ئەگەر لە دڵی خۆت، یان لە دڵی کەسێکی دیکەدا، گومان لە کاربەدەستی مەدینە یان مەککە یان لە کاربەدەستانی حیجاز هەبوو، یان خراپەیەکیان هەبوو بۆ ژێردەستەکانیان، لەو بارەیەوە نامەم بۆ بنوسە، سزای شایستەیان دەدەم.

مالیك بە مامۆستای خەلیفەکانی دوای (مەنصور) دادەنرێت، بۆیە ئامۆژگارییەکانی کاریگەریی لەسەر دەروونیان هەبوو.

کاتێك مالیك چوو بۆ لای مەهدی، ئەو وتی: ئامۆژگاریم بکە، وتی: ئامۆژگاریت دەکەم بە تەقوای خوا بەتەنها و، بەسۆز بوون لەگەڵ خەڵکی شارەکەی پێغەمبەر و دراوسێکانی، چونکە بیستومانە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: مەدینە شوێنی کۆچەکەمە، گۆڕەکەم لەوێیە، لەوێ زیندو دەبمەوە، خەڵکەکەشی دراوسێمن، لەسەر ئوممەتەکەمە لەڕێی دراوسێکانمەوە بمپارێزن، ئەوەی بیانپارێزێت لەڕۆژی قیامەت دەبمە گەواهیدەر و تکاکار بۆی.

لەدوای ئەم ئامۆژگارییە، مەهدی بەخششێکی زۆری دەرهێنا و بەخۆی بەماڵەکانی مەدینەدا دەگەڕا، کە ویستی بگەڕێتەوە، مالیك چوو بۆ لای، ئەویش وتی: من ئامۆژگارییەکەت دەپارێزم، هەتا سەلامەت بم، لێیان بەدور نابم.

مالیك كه‌ ده‌گه‌یشت به‌وان، زۆر ڕێزی خۆی ده‌گرت، تا ئامۆژگارییه‌كه‌ی كاریگه‌ریی هه‌بێت، چونكه‌ پێگه‌ی قسه‌ له‌ پێگه‌ی خاوه‌نه‌كه‌یه‌تی.

ده‌گێڕنه‌وه‌ كه‌ (مه‌هدی) هات بۆ مه‌دینه‌، خه‌ڵك هاتن سڵاوی لێ بكه‌ن، كه‌ خه‌ڵكه‌كه‌ دانیشتن، مالیك مۆڵه‌تی هاتنه‌ژووره‌وه‌ی خواست، خه‌ڵكه‌كه‌ وتیان: ئه‌مڕۆ مالیك له‌ كۆتایی خه‌ڵكه‌كه‌ داده‌نیشێت، كه‌ هاته‌ ژووره‌وه‌ و جه‌نجاڵییه‌كه‌ی بینی، وتی: ئه‌ی ئه‌میری بڕواداران، مالیكی مامۆستات له‌كوێ داده‌نیشێت؟ وتی: لای خۆم، جا به‌ناو خه‌ڵكه‌كه‌دا تێپه‌ڕی تا گه‌یشته‌ لای، (مه‌هدی) ڕانی ڕاستی گرت و له‌ ته‌نیشت خۆی داینیشاند.

مالیك له‌گه‌ڵ خه‌لیفه‌كان ئاوابوو، ته‌نها له‌ ته‌نیشتیان داده‌نیشت، به‌ڵام له‌ مزگه‌وت له‌كاتی نوێژ، له‌ كۆتایی دانیشتوه‌كان داده‌نیشت، ئامۆژگارییه‌كانی ته‌نها به‌ دواندن نه‌بوو، به‌ڵكو به‌ نامه‌ش ئامۆژگاریی ده‌كردن و بۆی ده‌ناردن، له‌ یه‌كێك له‌ نامه‌كانیدا بۆ خه‌لیفه‌كان هاتووه‌:

بزانه‌ كه‌ خوا تایبه‌تمه‌ندی كردویت كه‌ ئامۆژگاریت بكه‌م به‌وه‌ی پێشتر ئامۆژگاریم كردیت، شتێكم بۆت هێناوه‌ خوازیارم خوای گه‌وره‌ بیكاته‌ مایه‌ی كامه‌رانی تۆ، كارێكیشه‌ تا ڕێگه‌كه‌ت به‌ره‌و به‌هه‌شت بێت، جا ئه‌وه‌ بكه‌ كه‌ بۆم نووسیویت، خوا ڕه‌حم به‌ ئێمه‌ش بكا

لەگەڵ تۆدا، لەگەڵ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا، بەجێهێنانی کاروباری ئەوانەی خوای گەورە تۆی کردۆتە سەرپەرشتیاریان، تۆ بەرپرسی لێیان، بچوك و گەورەیان، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: هەموتان شوانن و هەمووتان بەرپرسن لە ژێردەستەکانتان.

لە هەندێك فەرموودەدا هاتووە کە والی دێنن و دەستی بەملیەوە کۆتوبەند کراوە، تەنها دادوەری دەیکاتەوە، عومەری کوڕی خەتاب دەیوت: بەخوا ئەگەر بەرخێك لە کەناری فورات بە ونبوون لەناوبچێت، وای دەبینم کە خوا لەبارەیەوە لە عومەر بپرسێتەوە. عومەر دە ساڵ حەجی کرد، پێم گەیشتوە کە لە حەجەکەیدا تەنها دوانزە دیناری خەرج دەکرد، لە سێبەری داردا دادەنیشت، هەندێك شیری دەکردە ملی، بە بازاڕەکاندا دەگەڕا و پرسیاری حاڵی ئەوانەی دەکرد کە هاتوون و ئەو نەیبینیون.

بیستومە کە کاتێك برینداربوو، هاوەڵانی پێغەمبەر هاتنە لای و ستایشیان کرد، وتی: لەخۆباییە ئەوەی پێیدا هەڵدەدەن، ئەگەر هەرچی لەسەر زەوییە زێڕ بێت، دەیبەخشم بۆ ڕزگاربوون لە ناخۆشییەکانی سەرەتای قیامەت، عومەر مژدەپێدراو و سەرکەوتوو بوو، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) گەواهی بەهەشتی بۆ دابوو، لەگەڵ ئەوانەشدا، کە کاروباری مسوڵمانانی کەوتە دەست، دەترسا،

ئەی چی دەربارەی ئەوەی دەیزانی، پێویستە ئەوە بکەیت کە لەخوات نزیك دەکاتەوە و سبەی ڕزگارت دەکات لێی، وریای ڕۆژێك بە کە تەنها کارەکانت ڕزگارت دەکەن، با ئەوانەی پێش خۆت بۆت ببنە نمونە، پێویستە پارێزکار بی لە خوا، ویستت هەر کارێك بکەیت سەرەتا بەوە دەست پێبکە، لە هەموو کاتەکانتدا بۆ ئەوانە بڕوانە کە بۆتم نوسیوە، وابکە دەروونت لەسەری ڕابێت و کاری پێ بکات، ڕەوشتت لەسەر ئەوە بێت، داوا لە خوا بکە سەرکەوتن و ڕاستڕەویت پێ ببەخشێت.

ئەوەی مالیك زیاتر بۆ والییەکان و خەلیفەکان لێی دەترسا، پێداهەڵدانی درۆ بووە، کە خەڵکێکی دەورووبەر دەیکەن، بەوەش کارەکانیان دەڕازێنێتەوە و، لەبەرچاویان خراپ دەبێتە چاك و ناشیرین دەبێتە جوان، ئەوسا دەروونیان جێگای ڕێنمایی ڕێنماییکەرانی تێدا نابێتەوە .

بۆیە هەرکاتێك بەرەوڕوو ستایشی والییەکان بکرایە، مالیك توڕە دەبو و والییەکانی لەو جۆرە کەسانە وریا دەکردەوە.

دەگێڕنەوە جارێك والی لای مالیك بوو، هەندێك لە ئامادەبوان ستایشیان کرد، مالیك توڕەبوو، پێی وت نەکەی ستایشی ئەوانە فریوت بدات، ئەو کەسەی ستایشت بکات و شتێك لەبارەوە بڵێت کە تێتدا نییە، لەوانەیە خراپەیەکیشت لەبارەوە بڵێت کە تێتدا نییە، جا

پارێزکاربه لەخوا کە تەزکیەی خۆت بکەی، یان لە کەسێکی قبوڵ بکەی، بە قسەیەك کە بەرەوڕووت دەیکات، تۆ لەوان چاکتر خۆت دەناسیت، پێم گەیشتوە کە لە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ستایشی پیاوێك کرا، فەرمووی: پشتیتان یان ملیتان بڕی، ئەگەر بیبینێ ڕزگاری نابێ. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: خۆڵ بکەنە ڕووی ئەوانەی بە خەڵکدا هەڵدەدەن.

# زانستی مالیك[1]

مالیك له زانستی سوننه‌دا گه‌یشته لوتكه، له فیقهدا گه‌یشته ئاستێك، بووه تاكه فه‌قیهی حیجاز، به‌م شێوه‌یه فه‌رمووده و فیقهی كۆكرده‌وه، له‌نێو فه‌رمووده‌ناساندا پێشه‌وایه و یه‌كه‌مین كه‌س بووه فه‌رمووده‌ی نووسیوه‌ته‌وه، (الموطأ) یه‌كه‌مین كتێبی دروستی كۆكراوه‌ی نوسراوی فه‌رمووده‌یه. له فیقهیشدا زۆر بیرتیژ بووه، له فیقهه‌كه‌یدا ته‌واومه‌ندیی ئایینی و له‌به‌رچاوگرتنی به‌رژه‌وه‌ندیی خه‌ڵكی كۆكردۆته‌وه، پایه‌به‌رزی و ڕۆحانییه‌تی ئایینی تێدایه و تێبینی لایه‌نی خواوه‌ندیش كراوه، به هه‌مان شێوه‌ش به‌رژه‌وه‌ندییه‌كانی خه‌ڵك و ژیانه واقیعییه‌كه‌یان ڕێك ده‌خات، ئه‌و

---

[1] ئیمامی مالیك زانسته‌كه‌ی ئه‌وه‌نده فراوان بووه گه‌یشتۆته ئه‌و ڕاده‌یه‌ی ڕێبازێكی تایبه‌ت دروس ببێت، قوتابییه‌كانی ئه‌م ڕێبازه‌یان وه‌رگرت و په‌ره‌یانپێدا، ئیمام بۆ ئیستنباطي علم له مه‌زهه‌به‌كه‌یدا پشتی به‌ستووه به‌م سه‌رچاوه بنه‌ڕتییانه: ١- قورئانی پیرۆز. كه ئه‌سڵی شه‌ریعه‌ت و سه‌رچاوه‌ی بنه‌ڕه‌تیه‌تی. ٢- سوننه‌تی پیرۆزی پێغه‌مبه‌ر، كه ڕوونكه‌ره‌وه‌ی قورئانه، ئیمام فه‌رمووده موته‌واتیر و مه‌شهوره‌كانی به‌كارهێناوه. ٣- وته‌ی صه‌حابه‌كان، له‌فیقه و فتواكانیاندا. ٤- كۆڕای زانایان. ٥- كرده‌وه‌ی خه‌ڵكی مه‌دینه. ٦- قیاس. ٧- به‌رژه‌وه‌ندی به‌ربڵاوی كۆمه‌ڵگا. ٨- الاستحسان. ٩- سد الذرائع. ١٠ عورف و عاده‌ت. (امام مالك، د.طارق السویدان ).

فەقیهە لە فیقهەکەیدا، لە هەموو فەقیهەکان زیاتر بەرژەوەندییە دنیاییەکانی لەبەرچاو گرتوە، هەر بۆیە لای ئەو بەرژەوەندی (مرسل) بۆخۆی بنچینەیەکی دامەزراوە لە نێو بنچینەکانی فیقه.

مالیك ئەوەندە لە ستایشی زانایان بەشی هەبووە، کەس پێش ئەو نەیبووە، فەقیهانی ڕەئی و زانایانی فەرموودەش ستایشیان کردوە، لە هەردوو لا جێی باوەڕ بووە:

- (أبو یوسف)ی هاوەڵی (أبو حەنیفە) کە هاوسەردەمی مالیك بووە، دەڵێت: کەسم نەبینیوە زاناتر بێت لەم سیانە: مالیك و ابن ابو لەیلی و أبو حەنیفە.. ئەو دوانە مامۆستای بوون، واتا مالیکی لەڕیزی مامۆستاکانی داناوە.

- (عبدالرحمن بن مهدی) دەڵێت: پێشەوایانی فەرموودە، کە پێشەنگن، چوارن: (سوفیانی ثە وری) لە کوفە، مالیك لە حیجاز، (ئەوزاعی) لە شام، (حەماد بن زید) لە بەصرە. بەراوردێکیشی کردوە لە نێوان (ثوری) و (اوزاعی)، کە یەکەمیان پێشەوای فەرموودەیە نەك سوننە، دووەمیش پێچەوانەی سوننەیە نەك فەرموودە، مالیکیش لە هەردو زانستەکەدا پێشەوا بووە.

لەوانەیە پێشەوایەتی مالیك لە فەرموودە و سوننەدا لەبەر ئەوە بێت کە فەقیە بووە، فەرموودەی لەبەر کردووە و لەگەڵیدا فەتوای

هاوەڵان و تابیعینیش دەزانێت، تا لە فەتواکانیدا لەگەڵ پێشینەکانی ئوممەت نەشاز نەبێت.

– (سوفیان بن عویەینە)ی هاوسەردەمی دەڵێت: ڕەحمەتی خوا لە مالیك، چەند توند بوو لە هەڵبژاردنی پیاواندا.. ئێمە لە ئاست مالیکدا نەبووین، بەڵکو شوێن پێی ئەو دەکەوتین، سەرنجمان دەدا، مالیك لەبارەی هەرکەسێ بینوسیایە، ئێمەش لەبارەیەوە دەماننوسی.. تەنها فەرموودەی صحیحی ڕادەگەیاند، تەنها لە متمانەدارەکانەوە شتی دەگێڕایەوە، پێم وایە دوای مردنی (مالیك بن أنس)، مەدینە وێران دەبێت.

– شافیعی لەبارەیەوە دەڵێت: ئەگەر شتێکت لە مالیکەوە بیست، بەتوندی دەستی پێوە بگرە.. ئەگەر هەواڵێك هات، ئەوا مالیك ئەستێرەیە.. ئەگەر باسی زانایان کرا، ئەوا مالیك ئەستێرەیە.. کەس نەگەیشتوەتە ئاستی مالیك لەزانستدا بەهۆی لەبەرکردن و وردی و پارێزیەکەی، ئەوەی فەرموودەی صەحیحی بوێت، با بچێتە لای مالیك.

– أحمد بن حنبل دەڵێت: مالیك گەورەی گەورەکانی ئەهلی عیلمە، پێشەوایە لە فەرموودە و فیقهدا، کێ وەك مالیکە، بە شوێنەواری پێشینەکاندا ڕۆشتوە، لەگەڵ بەکارهێنانی ژیری و ئەدەبدا.

بەو شێوەیە گەواهیی زانایان بە ڕێژنە بەسەر مالیك دادەبارێت، ( ) لەڕووی زانستەکەی، بێگەردیی زانستەکەی، پارێزکارییەکەی لە زانستدا، پێشەوایەتییەکەی لە فەرموودە و فیقهدا پێکەوە، لە هەر حوکمێکدا ڕایەکی هەبووبێت، بەپێی بەڵگەیەك بووە، ئەگەریش کاری بە قیاس کردبێت، لەسەر بنچینەی سوننەت و شوێنکەوتەیی دایمەزراندوە.

ئەم پایە زانستییەی مالیك لە ئەنجامی سازبوونی چەندین هۆ بووە: بەهرە و سیفەتە کەسیەکانی، مامۆستاو خوێندنەکانی، سەردەم و ژینگەکەی.

با باسی هەر یەك لەو هۆیانە بکەین:

بەهرە و سیفەتەکانی:

خوای گەورە هەندێك سیفەت و بەهرەی بە مالیك بەخشیوە، تا وەك فەرموودەناس و فەقیهێك ڕێگای ڕاستی خۆی هەبێت و لەژێر تیشکی قورئان و سوننەت و شوێنەواری پێشینە چاکەکان ڕێبکات، لەوانە:

(أ) توانایەکی لەبەرکردنی هۆشیاری وای پێ بەخشرابوو، هەر شتێکی بەرگوێ کەوتبایە، بە وردی و وریایی تەواوەوە گوێی بۆ دەگرت، بە یەك جار گوێی لە زیاتر لە چل فەرموودە دەبوو، بۆ ڕۆژی دوایی هاتەوە و چل فەرموودەکەی بۆ (زەهری) گێڕایەوە کە

هەر لەوی بیستبوو، لە یەك دانیشتندا گوێی لە سی فەرموودە دەبێت و ناینوسێتەوە، هیچی لەیاد ناچێت تەنها یەك دانەی نەبێت، دەچێت بۆ لای (زەهری) و پرسیاری ئەو دانەیەی لێ دەكات، ئەویش دوای سەرزەنشت، ئینجا وەڵامی دەداتەوە، بەو شێوەیە لەبەركارێكی هوشیار بووە، هەتا (زەهری) پێی وتووە: تۆ لە هەڵگرانی زانستیت و تۆ چاكترین كۆگای زانستیت.

لەو سەردەمەدا پشت بەستنی خەڵك بە یادەوەرییان وایكرد لەبەركردن و هوشیارییان گەشە بكات، ئەوسا زانست لە كتێب وەرنەدەگیرا، بەڵكو لە زاری كەسەكانەوە، فەرموودەكان لەكتێبێكدا تۆمار نەكرابوون، بەڵكو لە دڵەكاندا بوون، كاتێك قوتابییان دەستیان كرد بە نوسینەوەی ئەو فەرمودانەی كە مامۆستاكانیان بۆیان دەگێڕانەوە، پشت بەستن بە یادەوەری وردە وردە كەم بوویەوە، نووسینەوە دەستی پێكرد، لەوانەیە ئەوە لە سەرەتای ژیانی مالیك بووبێت، چونكە ئەو هەرچی دەبیست، هەر لەو دانیشتنە، هەندێك جاریش دوای دانیشتنەكە دەینوسییەوە.

مالیك هەرچیان بۆ بگێڕایەتەوە لەبەری دەكرد و لە پەڕاوێكی تایبەت دەینووسیەوە، شتێكی بۆ قوتابییەكانی نەدەگێڕایەوە كە پێی وابێت بەرژەوەندی خەڵكی تیا نییە، بەپێی وردبینییەكانی ئەو دروست نییە، ڕاست و ناڕاستەكانی لێك جیادەكردەوە، هەتا لەدوای

وەفاتکردنی، دوو سندوقە کتێبیان دۆزییەوە، کە نوسیبونی و ئاشکرای نەکردبوون، مندالّی یەك لە قوتابییەکانی دەلّێت: لە پاشماوەکانی مالیك دوو سندوقمان دۆزییەوە، کتێبی تێدابوو، باوکم دەیخوێندەوە و دەگریا و دەیوت: ڕەحمەتی خوات لێبێت، تۆ زانستەکەت بۆ خوا بووە، سەردەمێکی زۆر لەگەلّی دانیشتم، نەمبیست ئەوانە بگێڕێتەوە کە ئێستا دەیخوێنمەوە.

(احمد بن صالح) دەلّێت: سەرنجم لە ئوسولی مالیك دا، بینیم هاوشێوەی دوانزە هەزار فەرموودە بوو، کە ئەوانە لەوکاتەدا فەرموودەی خەلّکی مەدینە بوون، بەلّام مالیك تەنها سێیەکی یان چارەکی لێ گێڕاوەتەوە.

شافعی دەلّێت: بە مالیك وترا: (ابن عویەینە) هەندێك فەرموودەی لایە کە لای تۆ نییە، وتی: هەرچیم بیست بیگێڕمەوە! کەواتە من گەمژەم، کەواتە دەمەوێ ئەو خەلّکە گومڕا بکەم، هەندێك فەرموودەم لە دەم دەرچووە، خۆزگە دەخوازم بۆ هەر فەرموودەیەك قامچییەکم لێ بدرایە و نەمگێڕابایەتەوە.

(ب) لەوانەی باسمان کرد دەرکەوت، کە مالیك لەڕێگەی وەرگرتنی زانستدا، چەند ئارامگر و کۆلّنەدەر بووە، بەسەر هەموو سەختییەکدا زالّبووە، لەبەر هەژاری هەتا داری بنمیچی خانوەکەی

فرۆشتووه، له نیوەڕۆی گەرمدا دەچووه بەردەرگای زاناکان و چاوەڕوانی دەرچوونیانی دەکرد، تا مزگەوت شوێنیان دەکەوت، له ساردترین کاتەکاندا لەبەر دەرگای مامۆستاکەی دادەنیشت، لەدانیشتنەکاندا بۆ خۆپاراستن له سەرما سەرینی دەخستە ژێر خۆی، مالیك له زانستخوازیدا تێکۆشەرێك بووه گەرما و سەرما نەیتوانیوه ڕێگریی لێبکات، بەڵکو له کاته هەره گەرم و هەره ساردەکاندا دەگەیشته ئامانجەکەی خۆی.

لەسەر توندیی مامۆستاکان ئارامی دەگرت و به سینگ فراوانی وەری دەگرت، چونکه ئەو زانستەی لەوانی وەردەگرێت، هەموو ئەو توندی و قسه ناخۆش و سەرزەنشته تاڵانه ڕادەماڵێت، ئەگەریش هەندێك جار بەبیٚ هۆ بووه.

وەك ئەوەی پێی وابێت که کۆشش لەزانستخوازیدا وادەکات له دەروونداا بچەسپێت، وەك هەر شتێکی دیکه، ئەوەی به ئاسانی بێت، ئەوەنده بەهای نابێت که دەروون هانبدات بۆ پاراستنی، بەڵام ئەوەی به سەختی بێت بەنرخ دەبێت، بۆیه دەپارێزرێت. هەربۆیه دەیوت: کەس لەم زانستەدا ناگات بەوەی دەیەویٚ، هەتا هەژاری کاری تیٚ نەکات و، زانستەکه نەخاته پێش هەموو بارودۆخێك.

هەربۆیه به کردار و گوفتار هانی قوتابییەکانی دەدا بۆ ئەوەی لەزانستخوازیدا بەرگەی سەختییەکان بگرن.

(موصعەب الزبیری) دەڵێت: حەبیب تەنها دوو وەرەقە یان دوو نیوی بۆمان دەخوێندەوە، نەدەگەیشتە سیان، خەڵك لەلایەکەوە دادەنیشتن و نزیك نەدەبونەوە و تەماشایان نەدەکرد، کە دەردەچوین و خەڵکەکەش دەردەچون، کتێبەکانیان بە کتێبەکانی ئێمە بەراورد دەکرد، ڕۆژێك هاتینە لای باوکمان، تا لای بمێنینەوە و لە کاتی شێوان بچین بۆ لای مالیك، ڕۆژێك باران تەڕی کردین، ئەو شێوانە نەهاتین بۆ لای و چاوەڕێی نەکردین و، خەڵك چوونە لای، بۆ بەیانی هاتینەوە بۆ لای، وتمان: (ابوعبدالله) دوێنێ باران تەڕی کردین، سەرقاڵی کردین لەوەی ئامادەبین، بۆمان دووبارە بکەوە، وتی: نا، ئەوەی ئەم کارەی بوێت ئارامی لەسەر دەگرێت.

ئەو پێی وابوو کە ئارامگرتن و هێزی ئیرادە، لە پێویستییەکانی زانستخوازین، ئەوەی ئەوانەی نەبێ ناگات بە ئامانجەکەی.

(ج) مالیك لە زانستخوازیدا زۆر دڵسۆز بوو، تەنها مەبەستی خودی خوا بوو، مەبەستی بەرزی و خۆبەزلزانی نەبوو، بۆ خۆ دەرخستن و دەمەقاڵێی نەبوو، لە خوێندنەکەیدا، دەروونی خۆی لە هەموو خلتەیەکی مەبەست و ئارەزوو پاککردەوە، دڵسۆز بوو لە گەڕان بە دوای ڕاسیتدا و بەڕاست و ڕەوانی ڕووی تێکرد.

دڵسۆزی نورێکە لە دەروون سەردەردەکات و فیکر ڕۆشن دەکاتەوە و، بە ڕێگەی ڕاستدا ڕێدەکات، کە هیچ خڵتەیەکی هەوا و ئارەزووی تێدا نییە، جا تیشکێکی ڕوحانی لەگەڵدا دەبێت، وا دەکات بەبێ هیچ لەنگییەك، دەرك بە کاروبارەکان ببات، چونکە شتێك نییە بێگەردیی فیکری لێڵ بکات، وەك هەور بەسەر هەقیقەتەکانەوە بێت و ڕێگەی عەقڵ نەدات دەرکی پێ بکات، هەرچەند دەروون لە هەواو ئارەزووەکان نقوم بێت، هەستەکانی زیاتر داگیر دەکات، ئەمەش وادەکات عەقڵی بەرامبەر هەقیقەتەکان کوێر بێت و، بەرچاوڕوونی نامێنێت و کاروبارەکانی پێ جیا ناکرێتەوە.

ئەوەی هانی دەدا بۆ دڵسۆزی ئەوە بوو کە ئەو زانستەی دەیخوازێت، پەیوەستە بە ئایینەوە، ئەوەش هۆیەکە بۆ نزیکبوونەوە لە خوای گەورە، کارەکانیش بەپێی نیەتەکانە، کەواتە بەقەد دڵسۆزییەکەی لە نیەتدا خێری بۆ دەنوسرێت، هەر بۆیە دەیوت: ئەم زانستە ئایینە، کەواتە سەرنج بدەن لەکێی وەردەگرن.

هاندەری بۆ دڵسۆزی ئەوەبوو کە پێی وابوو نوری زانست تەنها هاودەمی کەسێك دەبێت کە دڵی پڕ بێت لە پارێزکاری و دڵسۆزی، هەربۆیە لێی دەگێڕنەوە کە وتویەتی: زانست نورە و تەنها هاودەمی دڵێکی پارێزکاری ملکەچ دەبێت.

لەدیدی مالیکدا، دڵسۆزی و وازهێنان لە ئارەزو و خۆشییەکانی دونیا ڕێگەی زانستخواز ڕووناك دەکاتەوە، بۆیە دەیوت: هەرکەس خۆی لە دونیا بێنیاز بگرێت، خوای گەورە حیکمەت و دانایی پێ دەبەخشێت.

لە ئامۆژگاریی (ابن وەهەب)ی قوتابییدا وتی: ئەگەر ئەو زانستەی دەیخوازێت مەبەستت پێی پاداشتی لای خوا بێت، ئەوە خۆیەتی کە سودت پێ دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر مەبەستت لەو فێربوونە دونیا بێت، ئەوە هیچت بەدەستەوە نایەت.

لەبەر دڵسۆزییەکەی بۆ زانست، مالیك بە هەندێك کاروبارەوە پابەند بوو، لە هەندێکیش دوورکەوتەوە، پابەندی سوننەت و کاروبارە دیارە ڕوونەکان بوو، هەر بۆیە دەیوت: چاکترینی کاروبارەکان ئەوانەن کە ڕوون و ئاشکران، ئەگەر لەنێوان هەر دوو کاروبارێکدا بە گومان بویت، ئەوەیان وەرگرە کە زیاتر جێی دڵنیاییە..

پابەند بوو بە فەتوادان لەو بابەتانەی ڕوودەدەن بەبێ ئەوەی بیسەپێنێ، نەك لێی تێکچووبێ و، لە سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دورکەوێتەوە، بەرەو زیادەڕۆیی لە کاروبارەکان بڕوات و شتێك بسەپێنێ کە ناماقوڵە.

له فەتوادا پابەندی لەسەرخۆیی بوو، بیرێكی دووروودرێژ و قوڵی دەكردەوە، پەلەی نەدەكرد له فەتوادان، چونكه ئەو پەلەكردنه لەوانەیه بەرەو هەڵەی ببات.

– (ابن القاسم)ی قوتابیی دەڵێت: گوێم لێبوو مالیك دەیوت: بابەتێك هەیه چەند ساڵە بیری لیّ دەكەمەوە، هەتا ئێستا نەگەیشتومەتە ڕایەك.. هەروەها دەیوت: لەوانەیه پرسیارێكم لیّ بكریّ، هەر هەموو شەوەكەم خەو نەچێتە چاوم تا بگەمە وەڵامێك.

– (ابن عبدالحكم) دەڵێت: مالیك ئەگەر پرسیاری بابەتێكی لێبكرایه، بە پرسیاركەرەكەی دەوت تۆ برۆ هەتا بیرێكی لیّ دەكەمەوە، ئەویش دەڕۆشت، دەمانبینی تیایدا دوودڵە، لەوبارەوە قسەمان لەگەڵ كرد، دەستی كردە گریان، وتی: دەترسم بەهۆی ئەو پرسیارانەوە ڕۆژێكم بەسەردا بێت، چۆن ڕۆژێك!

هەروەها دەیوت: ئەوەی حەزدەكات وەڵامی پرسیارێك بداتەوە، با خۆی لە بەرامبەر بەهەشت و دۆزەخ دابنێت، چۆن له ڕۆژی قیامەت ڕزگاری دەبێت.

– كەسێك پرسیارێكی لێكرد، وتی پرسیارێكی سوكە، توڕەبو و وتی: پرسیاری سوك و ئاسانە!! له زانستدا شتێكی سوك نییە، ئەی نەتبیستوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلاً

ثَقِيلاً ﴾؟ زانست هەر هەمووی قورسە، بەتايبەتی ئەوانەی لە ڕۆژی قيامەت لەبارەيەوە لێت دەپرسرێتەوە.

لە دڵسۆزيی بۆ قورئان و سوننەت، خۆی دەپاراستن لەوەی بڵێت ئەوە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە، بەبێ بوونی دەقێك لەو دوانە، بەڵام سەبارەت بەوانەی لە دەرەوەی قورئان و سوننەتدا بۆی دەچێت، ڕای خۆی دەڵێت بەبێ ئەوەی بەتەواوی حەرامی بكات، زۆرجار كۆتايی بە قسەكانی دەهێنا بەوەی دەيوت: ئەوە گومانی ئێمەيە و تەواو دڵنيا نيم.

نازانم لە فتوايدا:

لەبەر دڵسۆزيی ڕەهای بۆ فەتوا لە ئايينی خوادا، دوای ئەوەی بيری خۆی بەكاردەهێنا و نەدەگەيشتە ئەنجامێك، دەيوت: شارەزا نيم و نازانم، هەر بەوەش بەناوبانگ بووە، هەواڵ لەو بارەوە زۆرن.

دەوترێ لەبارەی بيست و دوو بابەتەوە پرسياری لێكرا، تەنها دوانی وەڵام دايەوە، بۆ ئەوانەی ديكە ڕايگەياند كە شارەزا نييە يان نايزانێت.

جاری وا هەبووە ئەو كەسەی دارای فەتوا دەكات، لەوپەڕی زەوييەوە هاتووە، پێی وابووە هاتووە بۆ لای كەسێك هيچ پرسيارێكی لێ گير نابێت، ماليكيش هەستی بەوە دەكرد، جا

پرسیارەکەی دەکرد، مالیکیش ئەگەر بە دڵنیایی ڕووە هەقەکەی نەزانیایە، دەیوت: شارەزا نیم، گوێشی نەدەدا بەوەی چۆن لەبارەیەوە بیر دەکاتەوە و، گومانەکەی هاتەدی یان نا.

- مالیك کە دەیوت نازانم، لەبەر ئەوە نەبوو کە بەتەواوی دەستەوسانە، وەك هەندێك بۆی دەچن، بەڵام ئەو کاتێك دەیوت نازانم کە ئەو وەڵامەی پێی گەیشتووە گومانێکە و ناشێت ڕاییگەیەنێت، یان هاوشێوەیەکی نەبینیوە لەو فەتوایانەی هاوەڵان کە بیستویەتی، یان لەوانەی بە پێشەنگیان دەزانێت، چونکە ئەو فەقیهێکی بیرتیژ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەترسا لەوەی شتێك بەناوی خواوە هەڵبەستێت.

هەندێك لە قوتابیەکانی زۆر جوان وەسفیان کردوە، کە وتویانە: فیقە کاری ئەو بووە، بەڵام خوای گەورە بە پارێزکارییەکەی بەرزی کردۆتەوە.

## دوورکەوتنەوەی لە مشتومڕ

دڵسۆزییەکەی لەمانە و زۆری تریش بوو، هەر ئەوەش وایکرد لە زۆر شت دوورکەوێتەوە، کە پێی وابووە شیاو نییە بۆ زانایەکی دڵسۆز، کە زانستخوازییەکەی بۆ خودی خوا و ئایینەکەی بێت، بۆیە تەواو لە مشتومڕ دوور دەکەوتەوە، چونکە مشتومڕ جۆرێکە لە

زۆرانبازی، ئایینی خواش لەوە گەورەترە کە ببێتە شوێنی زۆرپانبازی نێوان مسوڵمانان، لەبەر ئەوەی مشتومڕ زۆرجار بەرەو دەمارگیری بۆ فیکرەیەك دەچێت، بەبێ ئەوەی کەسەکان هەست بکەن، دەمارگیریش لە بابەتێکدا کە کەسەکە دیدێکی لابەلای هەیە لەبارەیەوە، وادەکات دەرك بە هەموو ڕووەکانی نەبات، بەڵکو تەنها یەك لای دەبینێت.

هەروەها پێی وابوو کە زانست لەوە بەرزترە ببێتە شوێنی مشتومڕ و پێشبڕکێ، چونکە لەوکاتەدا مەبەستی زاناکە ئەوەیە سەرنجی بیسەران بۆ خۆی ڕاکێشێت، ئەوەی بۆ بەدەستهێنانی سەرسامیی خەڵك قسە دەکات، هەق و ناهەق، ڕاست و درۆ دەڵێت.

هەروەها پێی وابوو کە مشتومڕ لە شکۆی زانایان ناوەشێتەوە، چونکە کاتێك مشتومڕیانە، بیسەران سەرنجیان دەدەن، هەروەك چۆن سەرنجی شەڕەکەڵەشێر دەدەن.

هەر بۆیە کاتێك (رەشید) داوای لێکرد بەربەرەکانی لەگەڵ (ابو یوسف) بکات، زۆر جوانی پێ وت: "زانست وەك بەشەڕدادانی ئاژەڵ و کەڵەشێر نییە".

هەربۆیە مالیك ڕێگریی لە مشتومڕ لە ئاییندا دەکرد، دەیوت: مشتومڕ لە ئاییندا سودی نییە.. مشتومڕ لە ئاییندا نوری زانست لە دڵی بەندەدا ناهێڵێت.. مشتومڕ دڵ ڕەق دەکات و کینەی لێ

دەکەوێتەوە. کەسانێکی بینی لەلای مشتومڕیانە، هەستا و پۆشاکەکەی داوەشاند و وتی: ئێوە لە شەڕدان، وتیان: کەسێك زانیاریی هەبێت لەبارەی سوننەتێکەوە مشتومڕی لەسەر نەکات؟ وتی: نا، بەڵام با ڕاییبگەیەنێت، ئەگەر لێی وەرگیرا باشە، ئەگەرنا با بێدەنگ بێت.

لەگەڵ ئەوەی ڕێگریی لە مشتومڕ کردووە و خۆی لێ بەدوور گرتوە، بەڵام چەند وتوێژێك دەگێڕنەوە لەنێوان مالیك و زانایاندا، وەك وتوێژی لەکەڵ (أبو یوسف) و هی دیکەش لەگەڵ هەندێك خەلیفەدا کە هەستێکی زانستی یان پێگەیەکی زانستییان هەبووە، وەك (ابو جەعفەری مەنصور)، لە ڕووکاردا ئەمە پێچەوانەی ڕێگرییەکەیەتی لە مشتومڕ. چونکە ئەو زانایەی شانی داوەتە بەر فەتوا، ناکرێ لە هەموو وتووێژێك خۆی دوور بگرێت، بەتایبەتی لە سەردەمێکدا ئاراستەی فەقیهەکان جیاواز بوون، بەهۆی جیاوازیی ئەو هاوەڵانەی زانستیان لێ وەرگرتوون، یان جیاوازیی ژینگە هەرێمی و فیکرییەکان، یان جیاوازیی ئاراستە عەقلی و دەروونییەکان، بۆیە مالیك لە وەرزی حەجدا، زۆرێك لەوانەی دەبینی کە زانستی ئەو فەقیهانەیان بڵاو دەکردەوە، دەبوایە وتووێژ بکەن و هەریەك بۆچونی خۆی ڕوون بکاتەوە، بە مەبەستی گەیشتن بە هەق.

هەر بۆیە هەندێك وتووێژی هەیە لەگەڵ هەندێك لە زانایان و هەندێك لەوانەی خۆیان بەفەقیە دادەنێت.

لێرەدا سیان لەو وتووێژانە دەخەینە بەردەست، کە تەنها بریتین لە پرسیار و وەڵام:

(أ) (ابو یوسف) پێی وابوو کە (ترجیع) لە بانگدا نییە و مالیك پێی وابوو کە هەیە، هیچ پەرستشێکیش بەبێ دەق نابێت، بۆیە لێی دەپرسێت: بە (ترجیع) بانگ دەدەن، کەچی هیچ فەرموودەیەکتان نییە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم). مالیك ئاوڕێکی لێدایەوە و وتی: سبحان الله، شتی لەمە سەیرترم نەبینیوە، بەبەرچاوی هەموو بینەرێکەوە، ڕۆژانە پێنج جار بانگ دەدرێت، نەوەکان لە باوانیانەوە بۆیان ماوەتەوە، لە پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) تا ئەم سەردەمەی ئێمە، ئایا پێویست دەکات بڵێین فلان لە فڵانەوە، ئەوە لای ئێمە لە فەرموودە ڕاستترە.

(ب) أبو یوسف لەبارەی بڕی ربە(صاع)[٢] پرسیاری لێ دەکات، دەڵێت کە پێنج ڕەتڵ و سێیەکی ڕەتڵێکە، دەپرسێ ئەمەتان لەکوێوە هێنا؟ مالیك بە هەندێك لە هاوەڵانی وت: ربەکانی خۆتان

[٢] یەکەیەکی پێوانەی ئەندازەکردنە، صاعێك چوار بستە، بۆ پێوانی شلەمەنیش دوو لیتر و نیوە. ئەم پێوانەیە لە کۆندا بەکارهێنراوە.

بێنن، ئەوانەی خەڵکی مەدینە بوون و بەگشتی نەوەی کۆچەر و پشتیوانان بوون، هاتنەوە و هەریەکەی ڕیەیەکیان پێبوو، دەیانوت: ئەمەمان لە باوك و لە باپیرەوە کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوون، بۆ ماوەتەوە، مالیك وتی: ئەم هەواڵە بەربڵاوە لای ئێمە لە فەرموودە چەسپاوترە.. (ابویوسف) لە قسەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە.

(عبدالملد بن الماجشون) دەڵێت: پیاوێکی خەڵکی عێراق پرسیار لە مالیك دەکات لەبارەی زەکاتی وەقفەوە، ئەویش دەڵێت ئەگەر هەتاهەتایی بێت نامێنێت، عێراقییەکە وتی: بەڵام (شەریح) وتویەتی: ئەوەی خوا فەرزی کردووە وەقفی بۆ نییە، مالیك پێکەنی، کە زۆر کەم پێدەکەنی، جا وتی: ڕەحمەتی خوا لە (شەریح)، نەیزانیوە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا لێرە چییان کردووە.

وتووێژەکانی مالیك بەم شێوەیە بوون، لە ڕوونکردنەوەی بابەتەکە، دەربڕینی بۆچونی خۆی زیاتر نەبوو.

- دڵسۆزیی مالیك بۆ زانست و فیقه، وایکردبوو کە لە زۆر گێڕانەوە دوورکەوێتەوە، هەربۆیە هەموو ئەوەی دەیزانی نەیدەگێڕایەوە، پێی وابوو ئەوەی زۆر دەگێڕێتەوە و هەرچی دەیزانێت باسی دەکات، گەمژەیە. خۆی لە زۆر فەتوادانیش بەدوور

دەگرت، تەنها فەتوای بۆ ئەوانە دەدا کە ڕوودەدەن و، لە فەتوادان بۆ ئەوەی لەوانەیە ڕووبدەن، خۆی بەدوور دەگرت و ئەوەی بە ئاژاوە دادەنا.

– وەڵامی پرسیاری زۆری نەدەدایەوە، نەوەك زۆریی وەڵامدانەوە بگاتە گریمانە، لەترسی ئەوەی زۆرییەکە توشی هەڵەی بکات، کەسێك شەش پرسیاری لێکرد و وەڵامی دایەوە، دواتر پرسیارێکی دیکەی کرد، پێی وت: زیاد لەپێویست پرسیارت کرد، لە کۆڕەکەی دەریکرد. ئەگەر هاوەڵەکانی زۆر پرسیاریان بکردبایە، دەیوت: وریابن، ئەوەی زۆر بڵێت، هەڵە دەکات.

لەوانەیە هۆی کەم وەڵامدانەوەی ئەوەش بێت کە نەیویستوە بیسەر بێزار بێت و ماندوو بێت، ئەوەش وادەکات فەرموودەکانی لێ تێکەڵ بێت و، شتێکی ناهەق بڵێت، هەربۆیە لە یەك دانیشتندا فەرموودەی کەمی دەگێڕایەوە.

– مالیك لەبەر بێگەردی و دڵسۆزیی بۆ هەق و زانست، وەڵامی پرسیاری پەیوەست بە دادوەرانی نەدەدایەوە، (ابن وهب)ی قوتابیی دەڵێت: گوێم لێبوو لەبارەی کاروباری دادوەرانی پرسیاری لێکرا، وتی: ئەوە لە پێویستیی دەسەڵاتە، گوێم لێی بووە کە نەنگیی دەگرت لە زۆر وەڵامدانەوەی زانایان، بەلای حوکمی دادوەرەکاندا نەدەچوو، نە بە ڕەخنە و نە بە بەدروست دانان.

قسەكردن لەبارەی حوكمی دادوەرەكان بە ڕەخنە لەبەردەم قوتابیان و هاوەڵان، وادەكات خەڵك جورئەت بكەن سەرپێچیی بكەن، یان بەلای كەمەوە ئەو شكۆیەیان دابەزێت، كە پێویستە بۆ ڕیشەكێشكردنی كێشەكان، تا دەرگای تانەدان لە حوكمەكان بە هەق و ناهەق نەكرێتەوە.

بەڵام ئەگەر ڕاوێژی پێ بكرایە، ڕێنمایی دەكردن، .دەسەڵات داوای فەتوای بكردبایە، فەتوای دەدا.

***

## بیرتیژی(فراسە) و خوێندنەوەی شاراوەکان:

یەکێك لەو بەهرانەی خوا بە مالیکی بەخشیبوو، بیرتیژی و خوێندنەوەی شاراوەکان بوو، لە جوڵەی لەش و شێوازی قسەکردندا، دەروونی خەڵکەکانی دەخوێندەوە.

(فراسە) بۆ بەرچاوڕونی و وریایی زۆر دەگەڕێتەوە، چاودێریی جوڵەی ئەندامەکان دەکات، بەراوردیان دەکات لەگەڵ بارە دەروونییەکان، هەموو ئەمانە خوای گەورە دەیبەخشێت، نەك بە ڕێکەوت یان پەروەردە بەدەست بێت، بەڵکو گەشەی پێ دەدرێت و بەهێز دەکرێت.

شافیعی، کە هەمان (فراسە)ی هەبوو، لەو بارەوە لێیان پرسی، وتی: لە مالیك وەرم گرتوە، لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێت کە مالیك گەشەی پێداوە.

شافیعی لەبارەی بیرتیژیی مالیك دەڵێت: کە چووم بۆ مەدینە، گەیشتم بە مالیك، گوێی لە قسەکانم گرت، ماوەیەك سەرنجی دام، بیرتیژیی هەبوو، پاشان وتی: ناوت چییە؟ وتم: محمد، وتی: محمد! لەخوا پارێزگار بە، لە سەرپێچی بەدور بە، تۆ پایەیەکت دەبێ لەناو پایەکان.

یەك لە قوتابییەکانی دەڵێت: مالیك بیرتیژییەکی هەبوو هەڵەی نەدەکرد.

## شكۆ و هەیبەتی ئیمام:

هەواڵ زۆرە کە مالیك ئەوەندە بە هەیبەت و شکۆ بووە، قوتابییەکانی سامیان لێی دەکرد، هەربۆیە ئەگەر کەسێك بچوایەتە ناو کۆڕەکەی و سەلامی لێ بکردنایە، بە چرپە و ئاماژە وەڵامیان دەدایەوە، ئاماژەیان پێدەکرد کە قسە نەکات، ئەویش پێی ناخۆش دەبوو کە بۆچی وا دەکەن، بەڵام کە بەباشی چاوی بە مالیك دەکەوت، دەکەوتە ژێر کاریگەریی تەماشاکردنە تیژەکانی، هەتا ئەویش وەك ئەوانی لێدێت، لەگەڵیان دادەنیشێت وەك ئەوەی باڵندە بەسەریانەوە نیشتبێتەوە.

دەسەڵاتدارانیش سامیان لێی هەبوو، لەبەردەمی هەستیان بە بچوکی دەکرد، منداڵە خەلیفەکانیش هەروا.

دەگێڕنەوە لە کۆڕەکەیدا لەگەڵ (ابو جەعفەر المنصور) دانیشتبوو، گەنجێکیان بینی دێتە دەرەوە و دەگەڕێتەوە، وتی: دەزانی ئەوە کێیە؟ وتی: نا، وتی: ئەوە کوڕمە، لە پیرێتی تۆ تۆقیوە.

هەتا خەلیفەکان خۆشیان سامیان لێی هەبوو، دەگێڕنەوە کە (مەهدی) بانگی دەکات و، کۆڕەکەی جەنجاڵ دەبێت بە خەڵك، شوێنی دانیشتن نامێنێت، کە مالیك دەگات، خەڵك خۆیان لادا تا گەیشتە

لای خەلیفە، ئەویش خۆی لادا و بەشێك لە شوێنەکەی خۆی پێدا، قاچێکی بەرز کردەوە تا شوێنی مالیك ببێتەوە.

بەم شێوەیە مامۆستای مەدینە ئەوەندە شکۆدار بوو، هەتا دەسەڵاتی لە دەسەڵاتی والییەکەی زیاتر بوو، کۆڕەکەی لە کۆڕی دەسەڵاتدار کاریگەرتر بوو، بەبێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتێکی هەبێت.

پێمان وایە هۆی ئەم شکۆ و هەیبەتە، هێزی ڕوح بووە، هەندێك کەس هەیە خوای گەورە کاریگەرییەکی روحیی پێ بەخشیون، وا دەکات دەسەڵاتیان بەسەر دەروونەکاندا هەبێت و دڵەکان کێش بکات، بۆیە قسەکانیان شوێنی لە دەروونەکان دەبێتەوە و شوێنەواری دەمێنێتەوە، کە دەدوێن وەك ئەوە وایە لەسەر دەروونەکان بنووسن.

مالیکیش خوای گەورە ئەم بەخششە روحیەی پێ بەخشیبوو، هەموو ژیانی دەبوە هۆی زیادبوونی و گەشەپێدانی، زیاتر دەردەکەوتنی و درەوشانەوەی، ژیانێك بریتییە لە عەقڵێکی ئاسۆ فراوان، زانستێکی زۆر، لەبەرکردنێکی هوشیارانە، وردیی لە کاروبارەکان، بیرتیژی و خۆگران ڕاگرتن، کەم قسەکردن و زیادەڕۆیی نەکردن تێیدا.

شكۆ تەنها بە قسە زیادەکان دەڕوات، زۆر قسەکردن وا دەکات بکەویتە هەڵەوە، هەر کەوتنێکیش لە قسەکردندا بەشێکی شکۆت دەبات و بەرەو بێبەهایی دەتبات.

لەگەڵ ئەوانەشدا کەسێك بوو، پارێزکار و لەخواترس و دڵسۆز لە کاردا، ڕاستگۆ لە گوفتاردا، بێگەرد لە هەموو ڕوکارێکی ژیاندا، سەرەڕای گرنگی دان بە ڕوکارەکان، کەلوپەلی ناوماڵ و پۆشاك و دیمەنی، چاکترین و ڕێکوپێکترین پۆشاکی دەپۆشی، گرنگی زۆری بە خاوێنی دەدا.

سەرباری ئەوانەش خوای گەورە قەدوباڵایەکی جوان و ڕێکوپێکی پێدابوو، قوتابییەکانی دەڵێن باڵابەرزی بەخۆوە بوو، سەر و ریشی سپی بوو، ناو چاوی زۆر سپی بوو، گلێنەی چاویشی گەورە بوو، ڕوویەکی جوانی هەبوو، لوتی بەرز و ڕیشێکی گەورەی هەبوو تا سینگی شۆڕ بووبوەوە، درێژ و پان بوو، لایەکانی سمێڵی دەبڕی و نەیدەتاشی و کورتی نەدەکردەوە، تاشینی وەك سوکایەتی دەبینی.

بەم شێوەیە هەموو سیفەتە جەستەیی و عەقڵییەکانی، ڕەوشت و حاڵەکانی بەشێوەیەك بوو کە شکۆی پێ بدات و سام لە دەروونی خەڵك دروست بکات.

مالیك ئەوەندە بە شكۆ و هەیبەت بوو، پادشا و خەلیفەكان ئیرەییان پێ دەبرد، بەبێ بوونی هێز یان زەبرێك لێی دەترسان، زیاتر لەوەی لە دەسەڵاتداران دەترسان.

– (سعید بن هند الاندلسی) دەڵێت: سامم لە هیچ كەس نەكردوە ئەوەندەی سامم لە (عبدالرحمن بن معاویە) دەكرد، (مەبەستی عبدالرحمن بن الداخل)، بەڵام كە چوومە لای مالیك، ئەوەندە سامم لێی كرد، هەیبەتی (ابن معاویە) لام بچوك بوەوە.

– لەبەر زۆری هەیبەتەكەی، قوتابییەكانی نەیاندەتوانی پرسیاری لێ بكەن، (ابن وەهەب) دەڵێ: كە هاتم بۆ مەدینە، خەڵك داوایان لێكردم كە لەبارەی نێرەموك پرسیار لە مالیك بكەم، كە كۆبونەوە و منیش دەبوایە پرسیارەكەیان بۆ بكەم، نەمتوانی بپرسم، هەموو ئەوانەش كە لە كۆڕەبوون نەیانتوانی بپرسن.

– شافیعی دەڵێت: سامم لە كەس نەكردوە وەك ئەوەی مالیكی كوڕی ئەنەس.

– والیی مەدینە لە هەموو خەڵك زیاتر سامی لێی دەكرد، هەتا لەبەر دەستی هەستی بە زەلیلی دەكرد.

كاتێك شافیعی دەگات بە مالیك و دواتر نوسراوێكی ڕاسپاردەی مالیك دەبات بۆ والی مەككە..

شافیعی دەڵێت: چومە لای والی مەککە، نوسراوەکەی ئەوم برد بۆ والیی مەدینە و، بۆ (مالیکی کوڕی ئەنەس)، هاتم بۆ مەدینە، نوسراوەکەم گەیاندە والی، کە بینی، وتی: گەنجۆ، بەڕاستی ڕۆشتن بەناوەندی مەدینەوە بۆ ناوەندی مەککە بەپێخواسی، لای من سوکترە لەوەی بچم بۆ بەردەم دەرگای (مالیکی کوڕی ئەنەس)، زەلیلی نابینم هەتا دەگەمە دەرگاکەی.

وتم: خوا ئەمیر پایەدار بکات، ئەگەر ئەمیر پێی باشە با هەواڵی بدرێتێ تا ئامادەبێت، وتی: مەحاڵە، خۆزگە کە من و هاوەڵەکانم بەسواری بەڕێدەکەوتین و لەڕێگە خۆڵمان بەسەردا دەباری، بەشێکی پێویستییەکانمان بەدەست دەهێنا.. وادەمان دانا کە عەسر بچین، هەمومان سوار بووین، بەخوا بە هەمان شێوە بوو، خۆڵ بەسەرماندا دادەباری، پیاوێك پێشکەوت و لە دەرگای دا، خزمەتکارێکی ڕەش هاتەوە دەرەوە..

ئەمیر پێی وت: بە گەورەکەت بڵێ کە من لە بەردەرگام، چووە ژوورەوە و دواکەوت، پاشان هاتەوە، وتی: گەورەم سەلامت لێ دەکات، دەڵێ ئەگەر پرسیارێکت هەیە لە پارچە وەرەقەیەك بۆمی بنێرە، وەڵامەکەت بۆ دەنێرمەوە. ئەگەریش بۆ فەرموودەتە، دەزانی ڕۆژی دانیشتن کەیە، کەواتە برۆ.

پێی وت: پێی بڵێ، نامەیەکی والی مەککەم لایە بۆ ئەو، لەبارەی بابەتێکی گرنگەوەیە، چوە ژوورەوەو هاتە دەرەوە، کورسییەکی لەدەست بوو، داینا، بینیم مالیك هاتە دەرەوە، هەیبەت و شکۆیەکی زۆری پێوە دیاربوو، پیرێکی باڵابەرز بوو، (تلیاسان)ی بەخۆیدا دابوو، والی نوسراوەکەی پێدا، گەیشتە ئەوەی کە دەڵێ: (ئەم پیاوە ئەوە کاروبار و حاڵیەتی، فەرموودەی بۆ بگێڕەوە، ئەوە بکە و ئەوە بکە).

نوسراوەکەی فڕێدا و وتی: سبحان الله، یانی زانستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وایلێهات لەڕێگای کەسانی دیکەوە وەربگیرێت، بینیم والی ناتوانێت قسەی لەگەڵدا بکات، چوومە پێشەوە و وتم: خوا پایەدارت بکات، من پیاوێکی (مەتلەبی)م ئەوە حال و چیرۆکی منە، کە گوێی لە قسەکانم بوو، هەندێك تەماشای کردم، فیراسەتی هەبوو، وتی: ناوت چییە؟

وتم: محمد، پێی وتم: محمد! لەخوا پارێزگار بە، لە سەرپێچی بەدور بە، پایەیەکت دەبێ لەنێو پایەکان.

***

## مامۆستاكانی

ئیمامی مالیك لەژینگەیەكی زانستی مەزندا گەورە بووە، لەخودی خۆیدا خۆشەویستی زانست و فێربوون هەبووە، مامۆستا و زانایانێك هاوسەردەمی بوون كەخاوەن علیم و مەعریفەت بوون، لەنزیكەی سەد مامۆستا زانستی وەرگرتووە.

بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری وەك زانایانی مەزنی دیكە چەندین شوێن و ناوچە گەڕاوە، زانیبێتی زانست لای هەركەس هەیە ڕۆشتووەتە خزمەتی و لێی بەهرەمەند بووە، بەلایەوە گرنگ نەبووە كەسەكە چ پلەو پایەیەكی زانستیی هەیە، ئەوەی گرنگ بووە لای كەكەسێكی موتەقی و پارێزكار بووبێت.

دەگێڕنەوە كەزانستی لە ئیمام (جەعفەر صادق كوڕی محەمەد باقر)یش وەرگرتووە، ئەمە لەكاتێكدایە كەمەزهەبەكەی ئیمامی مالیك جێی ڕەزامەندی عەلەوییەكان نییە، بگرە زۆریش پێچەوانە و دوورە لێیان، بەڵام ئەوە نەبووەتە ڕێگر لەوە لەخزمەتیدا بخوێنێت، بەجوانترین شێوەش وەسفی كردووە، دەڵێت:

((دەچوومە خزمەت جەعفەری كوڕی محمد، كەسێكی ڕووخۆش و قسەخۆش بوو، كاتێ ناوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەلای ببرایە، ڕەنگی سەوز و زەرد دادەگەڕا، بەسێ جۆر من دەمبینی، یان نوێژی دەكرد، یان بەڕۆژوو بوو، یان قورئانی دەخوێند. قسەی

لەشتێکدا نەدەکرد پەیوەندی بەوەوە نەبووایە، لەو زانا خواپەرستە دونیانەویستانە بوو کەلەخواترسن، هەرجاریٚ چوبمە خزمەتی دۆشەکەکەی ژێری دەردەهێنا و دەیدا بەمن لەسەری دابنیشم)).

بایەخی هەرە زۆری بە ئاشنابوونی ئەوە بووە کەلەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ماوەتەوە، لەگەڵ ئەو فەتوایانەی هاوەڵان کەلەسەری کۆك بوون، ئەوانەشی تێیاندا جیاواز بوون، هەردەم دەیووت: " فەتوادان دروست نییە، مەگەر بۆ کەسێك کە شارەزای ئەو شتانە بێت کەخەڵکی تێیدا جیاوازن، پێی وترا "جیاوازی ئەهلی ڕەئی؟" وتی: نەخێر، جیاوازی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هەروەها ناسخ و مەنسوخی قورئان و فەرمووده شارەزا بێت.

کەسێکی شارەزا و ئاگادار بووە لەزانینی هەموو شتەکانی سەردەمەکەیدا، بەڵام هەموو ئەوەی کەدەیزانی لەناو خەڵکدا بڵاوی نەدەکردەوە، تەنها عیلمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵان و تابعینی بڵاو دەکردەوە، ئاگاداری هەموو فیرقە جیاوازەکان بووە، بەڵام ئەوەی بۆ خەڵك ڕانەگەیاندووە، تەنها ئەوەی باس دەکرد کەپەیوەندار بووایە بەفەرموودە و فەتوادان بۆ خەڵکی لەکاروباری ڕۆژانەیان.

زۆر گرنگی دەدا بەزانینی فەتواکانی ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت)، چونکە سەردەمەکەی سەردەمی فراوانبوون و گەشەسەندنی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، چەندین خاك و وڵات و ناوچەی جیاواز کەوتە ژێر دەستی موسڵمانان، ئەمە بیری زانایانی بۆ دەرهێنانی حوکم نوێ دەکردەوە، تا ئەحکامی شەرعی سەبارەت بەبابەتە نوێیەکان دەربهێنن، لەبەر ئەوە زۆر گرنگی داوە بەفەتواکانی عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت)، لەگەڵ فەتوای ئەوانەی لەپێگەی زانستیا لەپاش ئەوەوە دەهاتن، وەك زەیدی کوڕی ثابت و ئیبن عومەر.

هەندێك لەزانایان وایان باس کردووە کەلەپاش ئیمامی عومەر زەیدی کوڕی ثابت ئیمامی خەڵك بووە، پاش ئەمیش عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، بیست ویەك کەس لەزەیدەوە گێڕانەوەیان هەیە، پاشان زانستەکەی ئەوانە گوێزراوەتەوە بۆ ئەم سیانە: ئیبن شەهاب و بکیری کوڕی عەبدوڵڵا و ئەبو زناد، لەمانیشەوە گەیشتووە بەئیمامی مالیك.

ئەمەش گوزارشتە لەگرنگیپێدانی مالیك بەفەتوای ئەو سێ هاوەڵە، باسی ئەوەشی بۆ کردووین کەچۆن زانست و زانیاری ئەو سێ هاوەڵە فەقیهە بەڕێزانەی وەرگرتووە، باس دەکات کە ئەمە گەیشتووەتە ئەوانەی لەمێژووی فیقهدا بەحەوت شەرعزانە تابعییەکە

ناسراون، بەڵام ئەم هەشتەمی بۆ زیاد کردوون و یەکێکی لێ سڕیونەتەوە. دواتر باسی ئەوانە دەکات کەڕاستەوخۆ زانستیان لەو تابعیانە وەرگرتووە، کەئەوانیش مامۆستاکانی ئەمن، کەلەخزمەتیاندا لەزانستەکەیان بەهرەمەند بووە، فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) لەوانەوە وەرگرتووە، ئەمەش دەقی قسەکەیەتی کە بۆ خەلیفە مەهدی دەکات:

"گوێم لەئیبن شەهاب بوو دەیووت: ئەم زانستەمان لەپیاوانی ڕەوزە وەرگرتووە، ئەوانیش سەعیدی کوڕی موسەیب و ئەبو سەلمە و عروە و قاسم و سالم و خارجە و سلیمان و نافع بوون، مالیك دەڵێت: "دواتر لەوانەوە ئیبن هورمز و ئەبو زناد و ڕەبیعە و ئەنصاری و دەریای عیلم ئیبن شەهاب، وانەی بەهەموو ئەوانە دەوتەوە".

ئەمانە دیارترین مامۆستاکانی ئیمامی مالیك بوون، متمانەی زۆری بەفەتواکانیان هەبووە، لێیانەوە گواستوویەتییەوە، ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان ماوەتەوە، ئەگەر سەرنج لەژیانی بدەین باس کراوە کەماوەی حەوت هەشت ساڵ لەلای ئیبن هورمز بووە، دایکیشی هانیدەدا کەلەخزمەت ڕەبیعەدا بێت، خۆیشی بەشوێن نافعدا دەڕۆیشت، پەیوەندیشی لەگەڵ ئیبن شەهابدا لەم وەسفەیدا دەردەکەوێت کەبەدەریای عیلم ناوی بردووە "بحر العلم ابن شهاب."

لەپاڵ ئەو پێنج مامۆستایەدا کەمالیك ناوی بردوون دەکرێت ناوی شەشەمیش بۆیان زیاد بکەین، ئەگەرچی لەپلەی عیلمدا لەوانیش باڵاترە، ئەویش نافیعی مەولای ئیبن عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت).

لەنێو ئەو زانایانەی ناویانمان هێنا، ئیبن هورمز زۆر بەکەمی باس و بەسەرهاتی بیستراوە، تەنها کاتێ باسی مالیك دەکرێت ناوی دێت، وادیارە زۆر سەرسام بووە پێی، برێکی زۆر زانست و ڕۆشنبیری گشتی و ئیسلامیشی لێ وەرگرتبێت، ئیبن هورمز پێی خۆش نەبووە فەرموودەی لێ بگێڕنەوە، نەهی کردووە مالیکیش فەرموودەی لێوە بگێڕێتەوە و لەسەنەدەکاندا ناوی بهێنێت.

لێرەوە دەتوانین مامۆستاکانی مالیك بکەین بەدوو بەشەوە: بەشێکیان فیقهو ڕەئی لێوەرگرتوون، بەشەکەی تریان فەرموودەی لێوەرگرتوون.

بەسەرهاتی ئیمامی مالیك لەگەڵ مامۆستاکانی و ئەوەی لەخزمەتیاندا فێر بووە، بەجێهێشتنی مامۆستایەك و چوونی بۆ لای مامۆستای دیکە و جیاوازی بۆچوون و عیلمی هەریەك لەمامۆستاکان، بەهەموویان کاریگەری قوڵیان لەسەر بەجێهێشتووە، ئەو باسە بەتەنها کتێبێکی پێویستە.

***

## خوێندن و تاقیکردنەوە تایبەتەکانی

مرۆڤ تا ئەوکاتەی داوای فێربوونی عیلم بکات زانایە، ئەگەر وای گومان برد کەتەواو فێربووە ئەوا نەفامە. زانایانی چاکی پێشین ئەوەها لەفێربوونی عیلم تێگەیشتبوون، لێبڕان و دڵسۆزیان بۆ خودا لەفێربوونی عیلمدا پاڵنەریان بوو، کەبەردەوامی بدەن بەڕێگەی فێربوون، بۆیە لەژیانی زۆربەیاندا دەبینین کەپاش بەهرەمەندبوونیان لەخزمەت زانایانێکی پایەبەرزدا، دەرچوونیان بەمەبەستی وەرگرتنی زانست و زانیاری، زیاتر بارگە و بنەیان پێچاوەتەوە، چەندین شوێن و ناوچەی جیاوازی دوور و نزیك ڕۆیشتوون بۆ بەدەستهێنانی عیلمی زیاتر، ئاڵوگۆڕی زانیاریان کردووە، وانەیان وتووەتەوە و وانەیان وەرگرتووە، ئەزموون و بەهرەمەندی نوێیان بەدەست هێناوە.

چوونیان بۆ شوێن جیاواز و دوورەکان مێشکی فراوانتر کردوون، بەبەراوردکردنی ئەو هەموو جیاوازییەی بینیویانە توانای هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکانی فراوانتر و قوڵتر کردوون، بەوەش خزمەتێکی زۆری فیقهی ئیسلامییان کردووە.

بەڵام ئیمامی مالیك نەبیستراوە کە بۆ فێربوونی عیلم چووبێتە دەرەوەی خاکی حیجاز، دوورترین گەشتی بۆ بەشێکی خاکی حیجاز بووە، بۆ عەمرە یان حەج چووەتە مەککە، خەلیفەکان بانگهێشتیان کردووە بۆ سەردانی شاری بەغدا، بەڵام ئەو ئەمە وەڵامی بووە

بۆیان: "مەدینە باشترە بۆیان ئەگەر بزانن، بۆ خۆم باشتر لەمانەوە لەمەدینە و جێنەهێشتنی دراوسێەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نابینم."

وادیارە پێگەی لەشاری مەدینەدا وایکردبێت پێویستی بەگەشت و گەڕان بەدوای عیلمدا نەبێت، هەموو باشێتیەکانی گەشتی فێربوونی لەو شوێنەدا بەدی کردووە، بەرزترین زانایانی ئەو ڕۆژگارە دەهاتنە سەردانی شاری مەدینە، لەکاتی حەجدا دەهاتن و دەگەیشتنە خزمەتی ئیمامی مالیك، یان لەکاتی سەردانیاندا بۆ مەدینە بەیەك دەگەیشتن، لەمەدینەدا ئاشنای ژیان و ئاکار و گوفتاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان و تابیعین دەبوو، بەگەیشتنی بەو زانایانەی لەشوێنە جیاوازەکانەوە دەهاتن، شارەزای نەریتی خەڵکە جیاوازەکان دەبوو، تاوتوێی فەتوا و بابەتەکانیان دەکرد، فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ دەخوێندنەوە، گوێی لێدەگرتن.

بەگشتی دەتوانین بڵێین پاش ئەوەی مالیك زانستەکانی لەخزمەت زانایاندا وەرگرت و تەواو کرد، گەشتی فێربوونی ئەو لەوێدا کۆتایی نەهات، بەڵکو گەشەی پێدا، بەهۆی پەیوەندی زانستی لەگەڵ زانایانی سەردەمەکەیدا ، ئیدی ئەوانە شەرعزان بن، یاخود زانای

بوارەکانی تر، توانی گەشە بەتواناى زانستی خۆی بدات، ئەو پەیوەندییەشی لەگەڵ زانایان لەسێ لاوە بوو:

لایەنی یەکەمی: پەیوەندی لەگەڵیان لەکاتی حەج یاخود ئەوکاتە بوو کەسەردانی شاری مەدینەیان دەکرد.

لایەنی دووەمیش بەدانیشتنی و بەشداری بەردەوامی بوو لەکۆڕی فێربوون و زانستی زانایانی شاری مەدینە.

سێیەمیشیان بەکتێبەکانی.

سەبارەت بەگەیشتنی بەزانایان لەوەرزی حەجدا، لەگەڵ ئیمامی ئەبوحەنیفەدا بەخزمەتی یەك گەیشتوون، ئاڵوگۆڕی بیروڕاو بۆچوونیان کردووە، بەشەرعزان (فقیە) ناوی بردووە، ئەبوحەنیفەش بەهەمان شێوە ناوی ئیمامی مالیکی بردووە.

هەروەها گەیشتووە بەلەیسی کوڕی سەعد و ئەوزاعی و ئەبو یوسف و محمد، لەهەموو ئەو بەیەکگەیشتنانەدا زانستی وەرگرتووە لێیان ، ئەوانیش بەهەمان شێوە لەعیلمی ئەم بەهرەمەند بوون.

لێرەدا هەواڵێك دەگوازینەوە کەباسێکە لەنێوان ئەم و حمادی کوڕی ئەبوحەنیفەدا، لەمبارەیەوە لە (المدارك)دا هاتووە:

"حەمادی کوڕی ئەبوحەنیفە دەگێڕێتەوە چوومە خزمەت مالیك، بینیم لەماڵەوەیە و دانیشتووە، هاوەڵەکانیشی لەملاو لای

دەرگاکەوەن، هەریەکەیان بۆ خۆی مەجلیسێکی هەیە، منیش لەدەرگاکەدا وەستام، وتی: تۆ کێیت؟ وتم: فڵان کەسم، دەمەوێت لەبارەی بابەتێکەوە پرسیارت لیٚ بکەم.

وتی: وەرە ژوورەوە، چوومە ژوورەوە، لەبەردەم خۆیدا داینام، کاتیٚ هاوەڵەکانی ئەوەیان بینی هەموویان کۆڕ و مەجلیسەکانی خۆیانیان بەجیٚ هێشت و چوونە دەرەوەی ماڵەکە، پێی وتم: باوکت لەبارەی ئەمەوە چی دەوت، منیش بۆم باس دەکرد، پرسیاری دەکرد بەڵگەی چی بوو، پێم دەووت، زۆر پرسیاری لەبارەی مەزهەبی ئەبوحەنیفە و بەڵگەکانییەوە لێدەکردم، پاشان وتی: پرسیارەکەت بکە، منیش پرسیارم کرد و وەڵامی دامەوە، کاتیٚ چوومە دەرەوە هاوەڵەکانی هاتنەوە ژوورەوە".

لەمەوە دەردەکەوێت، لەکاتێکدا ئەو پلەوپایەیەکی زانستی دیار و بڵندی هەبووە، ماڵەکەشی لەلای قوتابییان و زانایانەوە جیٚ مەبەست بووە لەهەموو شوێنێکەوە هاتوون، سەرکردایەتی هەردوو بواری فەرموودەو فیقهی هەبووە، بەڵام لەپرسیارکردن و گەڕان و وەرگرتن ڕاینەوەستاندووە، تەنانەت دەرفەتێکی وەك هاتنی کوڕی ئەبوحەنیفەشی لەدەستی خۆی نەداوە.

سروشتی وابووە وەڵامی نەداوەتەوە تابەڵگەی چەسپاوی شەرعی لەلا نەبووبێت، زۆرجار داوای لەپرسیارکەر کردووە بڕوات، دواتر

بیری لەبابەتەکە کردووەتەوە، تا گەیشتووتە ئاڕاستەی دروستی وەڵامەکە، باسی ئەوە دەکات هەندێك بابەت چەندین ساڵ بیری کردووەتەوە لێیان.

وادەردەکەوێت کە زۆر حەزی کردووە لەشەرعزانانی دیاری عێراق ئاگادار بێت، وەك ئیبن ئەبی لەیلا و ئیبن شبرمە و ئەبوحەنیفە، هەندێك کتێبی ئەبو یوسف دەرکەوتوون زیاتر ئەو گومانە هەیە کەئیمامی مالیك لەکاتی دەرکەوتنی ئەو کتێبانەدا زیندوو بووە، وەك کتێبی (الخراج) و کتێبی (إختلاف)ی ئیبن ئەبی لەیلاو (الرد علی سیر الاوزاعی). مردنی ئەو دوو کەسە نزیکە لەیەکەوە، بەجۆرێك ماوەی نێوان وەفاتی هەردووکیان چوار ساڵ زیاتر نابێت، ئەگەر ئەوکاتەی مالیك لەژیاندا بووە ئەو کتێبانە بڵاو بووبنەوە ئەوا دەبێت خوێندبێتیەوە چونکە بایەخی داوە بەزانینی بۆچوونی ئەبوحەنیفە.

## کۆڕ و دانیشتنەکانی:

ئیمامی مالیك لەشاری مەدینەدا کۆڕو دانیشتنی تایبەتی لەگەڵ زانایانی بەناوبانگ هەبووە، چ ئەوانەی لەشاری مەدینەدا نیشتەجێ بوون، چ ئەوانەی لەشوێن و ناوچەکانی ترەوە دەهاتنە شارەکە، ئەمانەش زۆر بوون، زۆریان بۆ وەرگرتنی عیلم دەهاتن و دەمانەوە، بۆ وەرگرتنی فەرموودە دەهاتنە خزمەتی، هەبوو ماوەیەکی زۆر

لەلای دەمایەوە و لەخزمەتیدا دەیخوێند، محەمەدی کوڕی حەسەن سێ ساڵ لەسەرەتای حوکمڕانی خەلیفە مەهدیدا لەخزمەت ئیمامی مالیك مایەوە، محەمەد لەڕاویەکانی فیقهـ بوو لەعێراق، ئەمەش دەرفەت بووە بۆ ئەوەی زیاتر ئاگاداری فیقهی ئەبوحەنیفە ببێت.

بەهۆی بایەخپێدانی تایبەتیشیەوە بەفقهـ کۆڕ و دانیشتنی تایبەتی هەبووە، شەرعزانانی شاری مەدینە کۆدەبوونەوە، زانایانی دیکەش بەشدارییان دەکرد، ئەمە بۆ عامەی خەڵك نەبوو، لەمبارەیەوە لە (المدارك)دا هاتووە: " ئیبن مونزیر دەڵێت: مالیك حەلقەیەکی دانیشتنی هەبوو لەگەڵ شەرعزانانی مەدینە، هەرکەس دەهات لەو شوێنەی دادەنیشاند کەکۆتایی شوێنی دانیشتنەکە بوو، کەسی بەبەرزتر سەیر نەدەکرد و کەسی لەبری کەسی تر هەڵنەدەساندەوە".

دیارە لەم کۆبوونەوەیەی شەرعزاناندا تاوتوێی بابەتە فیقهیە گرنگەکان کرابێت، لەمەشدا شوێنی هەرە دیار بۆ مالیك بووە، بەڵام وەك وانە وتنەوەی مامۆستا بەقوتابییەکانی نەبووە، مامۆستا باس بکات و قوتابی گوێ بگرێت، بەڵکو بۆچوونی خۆیانیان دەربڕیووە و تاوتوێی باسەکە کراوە بەدەستەجەمعی.

## ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەگەڵ زانایان

نامە گۆڕینەوە لەگەڵ زانایانی سەردەمەکەی یەکێکە لەلایەنەکانی ژیانی ئیمامی مالیك، ئەمەش دەریدەخات کەپەیوەندی هەبووە لەگەڵ ئەو زانایانەی ناوچەکانی دیکە و ئاگاداری بیروڕایان بووە و لەڕێی نامەوە بیروبۆچوونی خۆی بۆیان خستووەتە ڕوو، لێرەدا نامەیەکی ئیمامی مالیك بۆ لەیسی کوڕی سەعد دەخەینە ڕوو، لەگەڵ وەڵامی نامەکە:

**نامەی ئیمامی مالیك بۆ لەیسی کوڕی سەعد**

" لەمالیکی کوڕی ئەنەسەوە بۆ لەیسی کوڕی سەعد، سڵاوت لێ بێت، من سوپاسگوزاری خودام بۆت کە جگە لەئەو خودایەکی تر نییە، بەڵام دواتر، خوای گەورە لەگەڵ ئێوەدا بەپەرستشی لەنهێنی و ئاشکرادا بمانپارێزێت و لەهەموو ناخۆشی و خراپەیەك بەدوورمان بگرێت:

بزانە خوا ڕەحمەت پێ بکات پێمگەیشتووە کە بەشتانێکی جیاواز فەتوا بۆ خەڵکی دەدەیت، پێچەوانەی ئەوەی خەڵکی ئێرە لەسەریەتی و لەو وڵاتەی ئێمەی لێیە، تۆ لەئەمانەت و فەزڵ و پێگەتدا لەلای خەڵکی وڵاتەکەت و پێویستی ئەوان بەتۆ و پشتبەستنیان بەوەی لەتۆوە پێیان دەگات، شایان بەوەیە کەلەخۆت

بترسیت و شوێنی ئەوە بکەویت کەئومێدەوارین بەشوێنکەوتنی ببێتە دەربازکارت، خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموویێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ﴾ التوبة: ١٠٠.

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿فَبَشِّرۡ عِبَادِ ۝١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ﴾ الزمر: ١٧-١٨.

خەڵکی شوێنکەوتەی خەڵکی مەدینە دەبن: هیجرەت بەرەو ئێرە بووە، لێرە قورئان هاتووەتە خوارێ، حەڵاڵ حەڵاڵ کراوە و حەرام حەرام کراوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێویاندا ژیاوە و وەحی بۆ هاتووە، فەرمانی پێکردوون و گوێڕایەڵی بوون، یاسای بۆ دارشتوون و پەیڕەویان کردووە، تا ئەوکاتەی وەفاتی کرد، خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی، سەڵات و سەلام و بەزەیی و بەرکەتی خوای گەورەی لەسەر بێت.

پاش ئەویش خەڵکی ئوممەتەکەی شوێنی کەوتن، ئەوەی فەرمانڕەوایەتی گرتە دەست پاش ئەوەی بەسەریان هات، ئەوەی زانیبوویان جێبەجێیان کرد، ئەوەشی لایان نەبوو پرسیاریان لەبارەوە دەکرد، ئەوەی بەهێزتر بوو ئەوەیان وەردەگرت لەئیجتیهادەکانیان و ڕووداوە نوێییەکانی سەردەمەکەیان. ئەگەر کەسێکیش سەرپێچی بکردنایە، یان بڵێین: کەسێکی تر بەهێزتر و

لەپێشتربووایە لەو وازی لەبۆچوونەکەی دەهێناو کاری بەبۆچوونەکەی تر دەکرد.

پاش ئەوانیش تابعییەکان هەمان ڕێگەیان گرتەبەر و شوێن ئەو سوونەتانە کەوتن، ئەگەر کارێك لەمەدینە دیار و کارپێکراو بێت و، کەس نەبینین پێچەوانەی بێت، بەهۆی ئەوەی لەبەر دەستیانە لەو میراتییەی کە ناشێت هەڵببەسترێت، ئەگەر خەڵکی ناوچەکانی تر وتیان: کارەکە لەناوچەکەی ئێمە وایە، ئەوانەی پێش ئێمەش بەمجۆرە لەسەری ڕۆشتوون –لەوەدا لەسەر متمانە نەبووە، هیچ شتێکیشیان لەوبارەوە نەبووە– ئەوا بۆیان شیاوە.

ڕەحمەتی خوات لێبێت، بۆخۆت سەرنج بدە لەوەی کەبۆم نووسیوویت، بزانە، خوازیارم تەنها ئامۆژگاریکردن لەپێناوی خوا وایکردبێت بۆتی بنووسم، بڕیار لای خۆتە و تایبەت بەخۆتە، ڕێزی پێویست لەنامەکەم بگرە، ئەگەر فێربیت دەزانیت کەمن لە ئامۆژگاریت کەمتەرخەمیم نەکردووە، خوای گەورە ئێمەو ئێوەش موەفەق بکات بۆ گوێڕایەڵی خۆی و گوێڕایەڵبوونی پێغەمبەرەکەی لەهەموو کارێکدا، بەهەرحاڵ سڵاو و ڕەحمەتی خوات لێ بێت."

لەکتێبی (المدارك) لەپاش نامەکە نووسراوە: ڕۆژی یەکشەمە، حەوتی صەفەر نووسراوە، وەك خۆی بەمەبەستی سوودگەیاندن هێناومانە، گێڕانەوەکەی صەحیحە.

# نامەی لەیس بۆ مالیك

لەکتێبی (المدارك)دا قازی (عیاض) هەندێك پێشەکی ئەو وەڵامەی هێناوە، کەلەیس لەوەڵامی نامەکەی مالیکدا نووسیوویەتی، تەواوی نامەکەی نەهێناوە، لەبەر ئەوە لەکتێبی (إعلام الموقعین)ی (إبن القیم) دەیهێنین، ئەمەش دەقەکەیەتی:

"سڵاوتان لێ بێت، سوپاسگوزاری خودام بۆتان کەجگە لەو خودای تر نییە.

دواتر، خوای گەورە ئێمە و ئێوەش بپارێزێت و عاقیبەتمان لەدونیا و ئاخیرەتدا چاك بکات: نامەکەتم پێگەیشت، باسی باشێتی حاڵتانت کردووە، کە مایەی خۆشحاڵیمە، خوای گەورە ئەوەتان بۆ بەردەوام بکات، لەسەر سوپاسگوزارییتان بۆی بە هاوکاریکردنتان تەواوتری بکات و چاکەی زیاترتان لەگەڵ بکات. سەرنجی خۆت سەبارەت بەو نوسراوانە خستووەتەڕوو کەبۆم ناردوویت و، چاکت کردوونەتەوە و لە کۆتاییەکەش خەتمی خۆت لێداوە، پێمان گەیشت، خوای گەورە پاداشتی چاکەت بداتەوە لەسەر ئەوەی ئەنجامت دا، ئەوانە نووسراوانێکن لەئێوەوە پێمان گەیشتووە، پێمخۆشبوو سەرنجی خۆت لێیان بگەم بە هەقیقەتەکەی.

باسی ئەوەت کردووە ئەوەی نووسیوومە بۆت لەهەڵسەنگاندن چالاکیی پێداویت، ئەوەی لەتۆوە پێم گەیشتووە بەئامۆژگاری

دەستی پێکردووە، ئومێدەواربوویت کەلای من ڕێزی هەبێت، ئەوەی هەبووە نەبووەتە ڕێگر، لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونت لەبارەمانەوە جوانە، هەرچەندە من وەك ئەوەم نەوتووە، وات پێگەیشتووە کەمن فەتوا بەجۆرێك دەدەم کە پێچەوانەی ئەوەیە کۆمەڵی خەڵکی لای ئێوەی لەسەرە، بەڕاستیش من ترسم هەیە لەخۆم بەهۆی پشتبەستن بەوانەی پێشخۆم لەوەی فەتواتان پێداوە.

خەڵکیش شوێنکەوتەی مەدینەن، کەهیجرەتی بۆ کراوە و قورئانی تێدا دابەزیووە و ئەوەی لەمڕووەوە نوسیووتە تەواوە، إن شاء الله تعالی، منیش لەو شوێنەدا دامنا کە پێتخۆشە، هیچ کەس شك نابەم خاوەن عیلم بێت، لەمن زیاتر ڕقی لەفەتوای شاز بێت و، زیاتر فەزڵی زانایانی پێشتری خەڵکی مەدینەی لا بێت و، زیاتر ئەو فەتوایانەی ئەوانی وەرگرتبێت کەموتەفیق بوون لەسەری. سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانییان کە هاوبەشی نییە.

ئەوەشی باست کردووە زۆر ڕاستە سەبارەت بەپایەو پلەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) لەمەدینەو هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بۆی لەنێو هاوەڵانیدا، ئەوەی خوای گەورە فێری کردوون، کە خەڵکی بەهۆیەوە بوونە شوێنکەوتەی ئەوان، هەر بەوجۆرەیە کەباست کرد.

بەڵام ئەوەی سەبارەت بەم ئایەتە باست کردووە:

﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾، زۆرێك لەو سابیقینانە بۆ جیهاد کردن لەپێناوی ڕەزامەندی خوا لەمەدینە چوونە دەر، هەریەکەو بەرەو ناوچەیەك، خەڵك لەدەوریان کۆبوونەوە، قورئانیان پیّ ڕاگەیاندن، لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەرەکەی، ئەوەی لەقورئان و سوننەتدا ڕاڤەی نەبوو ئەوا خۆیان بەڕەئی خۆیان ئیجتیهادیان دەکرد..

هەریەك لە ئیمامی ئەبوبەکرو عومەر و عوسمان کەموسڵمانان هەڵیانبژاردن لەپێش ئەو ئیجتیهادکارانەوەن، ئەم سیانە سەربازانی موسڵمانیان فەرامۆش نەکردووە، بێئاگاش نەبوون لێیان، بەڵکو بۆ گەیاندنی ئاین نامەیان بۆ دەناردن، ئاگاداریان دەکردنەوە لەئیختیلاف لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا، هیچ کارێکیان بەجیّ نەهێشتووە کەقورئان ڕاڤەی کردبێت، یاخود پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاری پیّ کردبێت یان ئەمان لەپاش ئەو کاریان پیّ کردبێت، ئەمانەیان فێر کردوون.

ئەگەر کارێکیش هاتبێتە پێش هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەمیسرو شام و عێراق، لەسەردەمی ئەبوبەکر و عومەر و عوسماندا کاریان پێ کردبێت و تا ئەوان وەفاتیان کردووە لەسەری ڕۆشتبن، فەرمانیان پێ نەکردبن کەئەنجامی نەدەن، ئەوا ئێمە بەدروستی نازانین موسڵمانانی ئەمڕۆ شتێکی نوێ بهێنن و کاری پێ بکەن کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و شوێنکەوتووەکانیان پێشتر کاریان پێ نەکردبێت.

لەگەڵ ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پاش ئەوە لەسەر زۆر شت ئیختیلافیان هەبووە، ئەگەر بمزانیایە نایزانیت ئەوا دەمنووسی بۆت، پاشان تابیعینەکانیش لەشتانێکدا پاش هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیختیلافیان هەبووە. سەعیدی کوڕی موسەیب و بەرامبەرەکانی توندترین ئیختلافیان لەنێواندا هەبووە.

دواتر ئەوانی لەپاش ئەوان هاتن نیشتەجێی مەدینەش بوون، سەرکردەیان لەو ڕۆژەدا ئیبن شەهاب و ڕەبیعەی کوڕی ئەبی عبدالرحمان بوو، خیلاف ڕەبیعە لەگەڵ هەندێك لەوانەی پێش خۆی ئەوەیە کەمن دەیزانم و ئێوەش لەوێ بوون و بۆچوونی ئێوەم لەبارەیەوە بیستووە. هەروەها قسەی خاوەن ڕەئی لەخەڵکی مەدینە یەحیای کوڕی سەعید، عوبەیدوالله کوڕی عومەر، کەسیری کوڕی

فەرقەد، جگە لەوان کەزۆریان بەتەمەنترن، تەنانەت بەهۆی پێناخۆشبوونی ئەوەوە حەزت لێیان نەبووە و کۆڕیانت بەجێهێشتووە، بۆچوونی تۆ و عبدالعزیز کوڕی عبدالله لەبارەی هەندێك لەوەی بەڕەخنەی دەزانین لەسەر ڕەبیعە لەوەدا، ئێوە ئەو دوانەتان هاوڕابوون لەوەی ڕەتتان کردووەتەوە.. ڕقتان لەوەیە کەمنیش ڕقم لێیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا سوپاس بۆ خوا ڕەبیعە خێری زۆری تێدا هەیە، خاوەن عەقڵێکی ڕەسەن و زمانێکی پاراو و فەزڵێکی ڕوون و ڕێگەیەکی باشە لەئیسلامدا و مەوەدەیەکی ڕاستگۆیانەی بەرانبەر براکانی بەگشتی هەیە، بۆ ئێمەش بەتایبەتی، خوای گەورە ڕەحمی پێ کردبێت و لێی خۆش بووبێت و بەباشترین شێوە پاداشتی دابێتەوە.

ئیبن شەهابیش ئەوەی پێمان گەیشتووە ئیختلافی زۆری هەبووە، ئەگەر هەندێکمان نامەی بۆ بنووسیایە ئەوا لەوانەبوو لەبارەی یەك شتەوە لەسەر فەزڵی بۆچوونەکەی و عیلمەکەی بەسێ جۆر وەڵامی دەدایەوە، کەهەندێکیان هەڵوەشێنەرەوەی ئەویتریان بوو، هەستی بەوە نەدەکرد کەپێشتر بۆچوونی چۆن بووە لەوبارەیەوە.

ئا ئەمەیە داوام لێدەکەیت واز لەوە بێنم کەپێم خۆش نییە وازی لێبێنم.

– ئەوەشم زانیوە کە، پێت خۆش نییە بۆچوونم وایە موسڵمانان لەشەوی باراناویدا دوونوێژ بەیەکەیەوە کۆبکەنەوە.

بارانی شام زۆر زیاترە لەبارانی مەدینە بەجۆرێك مەگەر هەر خوا بزانیّ چەند زیاترە، هیچ ئیمامێکیان لەشەوی باراندا دوونوێژی کۆنەکردووەتەوە پێکەوە، لەکاتێکدا ئەبوعەبەیدەی کوڕی جەڕاح، خالیدی کوڕی وەلید، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان، عەمری کوڕی عاص و مەعازی کوڕی جەبەل لەگەڵیاندا ژیاون. پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((أعلمکم بالحلال والحرام معاذ بن جبل)، واتە: ئاگادارترین کەستان لەحەڵاڵ و حەرام مەعازی کوڕی جەبەلە)، فەرمووشیەتی: (یأتي معاذ یوم القیامة بین یدي العلماء برتوة)، واتە: لەڕۆژی قیامەتدا مەعاز هەنگاوێك لەپێش زانایانەوە دێت.

شەرحەبیلی کوڕی حسنە و ئەبودەرداو و بیلالی کوڕی ڕەباحیش لەویّ بوون.

ئەبوزەر و زوبەیری کوڕی عوام و سەعەدی کوڕی ئەبی وەقاصیش لەمیسر بوون، لەحومسیش حەفتا کەس لەئەهلی بەدر هەبووە، لەهەموو ناوچەکانی وڵاتانی ئیسلامی هەبوون، لەعێراق ئیبن مەسعود و حوزەیفەی کوڕی یەمان و عمران کوڕی حوصین هەبووە، ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو تاڵبیش (کرم الله وجهه

في الجنة) چووەتە ئەویٚ، کۆمەڵێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)ـی لەگەڵدا بووە، هەرگیز نوێژی مەغریب و عیشایان پێکەوە کۆنەکردووەتەوە.

– نموونەی تریش، داوەریکردن بەشایەتیدانی شایەت و سوێندخواردنی خاوەن حەق، ئەوەی زانیبێتم هەتا ئێستاش لەمەدینە کاری پێدەکرێت، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەشام و حمص و میسر و عێراق کاریان پیٚ نەکردووە، خەلیفەکانی ڕاشیدین ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی نامەیان بۆ نەنووسیوون کاری پێبکەن.

– کاتیٚ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەسەڵاتی کەوتە دەست، هەروەك پێتگەیشتووە، کاری بۆ بوژانەوەی سوننەت کردووە و گەیاندنی ئایین و بۆچوونی دروست و ئاگاداربوون لەوەی پێشتر هەبووە لەکاروباری خەڵك– زەریقی کوڕی حەکەم نامەی بۆ نووسیووە، تۆ لەشاری مەدینە کارت کردووە بەشایەتیدانی یەك شایەت و سوێندخواردنی خاوەن حەق؟

عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش لەوەڵامیدا نووسیوویەتی: ئێمە لەمەدینە کارمان بەوە دەکرد، بینیمان خەڵکی شام بەجۆرێکی تر کار دەکەن، لەبەر ئەوە داوەری ناکەین بەشایەتیدانی دوو پیاوی دادپەروەر نەبێت، یان پیاوێك و دوو ئافرەت، هەرگیز نوێژی مەغریب

و عیشای لەشەوی باراندا پێکەوە کۆنەکردووەتەوە، لەکاتێکدا بارانی بەسەردا دەهاتە خوار لەو خانووەی تێیدا نیشتەجێ بوو.

– هەر لەوبابەتانەی ئەهلی مەدینە داوەرییان پێکردووە: مارەیی ئافرەتە، بەوجۆرە بووە کەهەرکاتێ ئافرەتەکە ویستبێتی مارەییە دواخراوەکەی پێ بدرێت قسەی کردووە و پێی دراوە، ئەهلی عێراقیش لەمەدا هاوڕای ئەهلی مەدینە بوون، ئەهلی شام و ئەهلی میسریش، هیچکام لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و پاش ئەوانیش مارەیی دواخراوی نەداوەتە ئافرەت، مەگەر پاش جیابوونەوەی نێوانیان بەهۆی مردنەوە، یان بەهۆی تەڵاقدانەوە، ئەوکاتە حەقەکەی بەردەکەوت.

– بابەتی دیکە، عبداللەی کوڕی مەسعود دەیووت: هەر پیاوێك ژنێکی کۆیلەی هێنا پاشان مێردەکەی کڕیەوە، ئەوا کڕینەوەکەی لێی بەسێ تەڵاقە دادەنرێت، ڕەبیعەش هەمان قسەی دەکرد، ئەگەر ئافرتێکی ئازاد شووی کرد بەکۆیلەیەك و کڕیەوە ئەوا وەك ئەوەی پێشوو وایە.

– لەئێوەوە شتێکمان پێگەیشتووە لەپارەی کچەوە زۆری لێکرابێت، لەمبارەیەوە هەندێکم بۆ نووسیبوویت، وەڵامی ئەو نووسینەت نەدامەوە، ترسام ئەوە قورس بووبێت لات، وازم هێنا

لەنامە نووسین بۆت لەو شتانەی کەڕەتت کردووەتەوە، یان ڕەئی خۆتت لەبارەوە هێناوە.

– بیستوومە فەرمانت کردووە بە زەفر کوڕی عاصمی هیلالی کاتێ ویستوویەتی نویژە بارانە بکات، نوێژەکە بخاتە پێش وتارەکەوە، ئەوەت بەلاوە هەڵەیەکی گەورە بووە، چونکە وتار و نوێژە بارانە وەك شێوازی ڕۆژی هەینی وایە، تەنها کە ئیمام لەوتارەکەی بوویەوە و پاڕایەوە، پۆشاکەکەی وەردەگێڕێت، پاشان دێتە خوارەوە و نوێژ دەکات.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نوێژەبارانەی کردووە، ئەبوبەکری کوڕی محەمەدی کوڕی حەزم و جگە لەمانیش کردوویانە، هەموویان خوتبەو پاڕانەوەکەیان خستووەتە پێش نویژەکەوە، خەڵکی هەموو کارەکەی زەفری کوڕی عاصمیان لا خۆش نەبووە.

– هەروەها پێم گەیشتووە کە تۆ لەبارەی دوو پارەی تێکەڵکراو (پارەی شەریکی)، وتووتە زەکاتی ناکەوێتە سەر، هەتا بەشی هەریەکەیان نەگاتە ئەو ڕادەیەی کەزەکاتدان تێیدا پێویستە، لەنامەکەی عومەری کوڕی خەتابدا زەکاتی دەکەوێتە سەر و وەك یەك دەیدەن لێی، لەسەردەمی حوکمڕانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا، پێش ئێوە کار بەوە کراوە و جگە لەویش کاریان پێ کردووە، ئەوەشی یەحیای کوڕی سەعید بۆی گێڕاوینەتەوە، بەبێ

زانایانی پایەبەرزی سەردەمەکەی نەبووە، خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات و لێی خۆش ببێت و سەرئەنجامی بەهەشت بێت.

– ئەوەشم پێگەیشتووە کە تۆ دەڵێیت: ئەگەر پیاوێك ئیفلاسی کرد، کەسێکیش شتێکی پێ فرۆشتبوو، بەشێکی لەنرخەکەی وەرگرتبوو، یان کڕیاری بەشێکی لێ خەرج کردبوو، ئەوا ئەوەی لە کەلوپەلەکەی مابووەوە دەیباتەوە، خەڵکیش بۆچوونیان وابوو کە لەسەر فرۆشیار پێویستە شتێك لەنرخەکەی وەرگرت، یان کڕیار بەشێکی لێی خەرج کردبوو، ئەوا خودی شتەکە نییە.

لەمبارەیەوە دەڵێی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەنها بەشی یەك وڵاخی داوە بەزوبەیری کوڕی عەوام، خەڵکیش هەموو باسی ئەوە دەکەن کەچوار پشکی بۆ دوو وڵاخ پێداوە و لەوڵاخی سێیەم بێبەشی کردووە، خەڵکی هەموو بەپێی ئەم فەرموودەیە کار دەکەن: خەڵکی شام، خەڵکی میسر، خەڵکی عێراق، خەڵکی ئەفریقیا کەسیان ڕاجیا نین لەمەدا، نەدەکرا وا بووایە، ئەگەریش تۆ لەکەسێکی ڕەزامەندەوە بیستبێتت، نەدەبوو پێچەوانەی هەموو ئوممەت بکەیت.

زۆر شتی تری هاوشێوەی ئەمەت بەجێهێشتووە، لەخوا داواکارم تەوفیقت بدات و زیاتر بمێنیتەوە لەژیاندا، بەو ئومێدەی ئەو سوودەی کەخوازیارم بەخەڵکی بگەیەنیت، لە لەناوچوون ناترسم،

مەگەر بەڕێشتی کەسانی وەك تۆ لەگەڵ خۆشەویستیم بۆ جێگەکەت، ئەمە پێگەتە لای من و ئەوە ڕەئی منە لەبارەتەوە، نامەکەم واز لیّ مەهێنەو هەواڵ و دەنگوباسی خۆت و باوك و کەس و کارتم بۆ بنێرە، لەگەڵ هەر پێویستییەك ئەگەر هەتبوو، یان کەسێك کەپێت بگات هەیبێت، من بەوە دڵخۆش دەبم.

بۆم نووسیت و ئێمەش صالح و پارێزراو بین، سەپاسگوزاری بۆ خودا: لەخوا دەپاڕێینەوە ڕزقمان بدات لەگەڵ ئێوە و اسگوزاری ئەوە بین کەپێی بەخشیووین و بەسەریدا ڕژاندووین، والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

ئەم دوو نامەیە لەمێژووی فیقهی ئیسلامیدا هەمیشە زیندوون، بەڵگەیە لەسەر ڕاجیایی و پەیوەندی نێوان زانایان و بیروڕا گۆڕینەوەیان، هەوڵیان داوە بۆ هەر باس و بابەتێك بەڵگەی خۆیان بەڕوونی بخەنە ڕوو.

***

# سەردەمی ئیمامی مالیك

مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەردەمی حوکمڕانی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیکی ئەمەویدا لەدایکبووە، لەسەردەمی خەلافەتی ڕەشیدی عەباسیدا کۆچی دوایی کردووە، سەردەمی دەوڵەتی مەروانییەی بینیووە، بینیوویەتی چۆن دەسەڵاتیان جێگیر بووە و حوکمڕانیان کردووە، بەهەمان شێوە داڕوخان و نەمانیشیانی بینیووە، لەسەردەمی عەباسییەکانیشدا بووە، ئەم دەسەڵات گۆڕینەی نێوان بەنی ئومەییە و بەنی عەباسی دیووە، هەموو ناکۆکی و ململانێکانی ئەو سەردەمەی بینیووە. پاشان بینیوویەتی چۆن لەسەردەمی هاروونە ڕەشیددا دەسەڵات جێگیر بووە و گەشەی سەندووە و شارستانیەتە جیاوازەکانی فارسی و هندی و عەرەبی تێکەڵ بەیەك بوون، بەجۆرێك کە لەبنەما ئیسلامییەکاندا جێی بووەتەوە، هەر ئەویش خاڵی کۆکەرەوە و یەکبوونیان بووە.

ئەتوانین بڵێین ژیانی ئیمامی مالیك بەجۆرێك دابەش بووە کەنیوەی لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا بووە، نیوەکەی تریشی سەردەمی عەباسییەکان، نزیکەی چل ساڵی تەمەنی لەسەردەمی حوکمڕانیی ئەمەوییەکاندا بووە، چل و شەش ساڵیشی لەسەردەمی حوکمڕانیی عەباسییەکاندا، تەمەنی تەواو پێگەیشتوو بووە کاتێ

دەوڵەتی ئەمەوی ڕوخاوە، تەمەنیشی تەواو پێگەیشتوو بووە کەدەسەڵات بۆ عەبباسییەکان جێگیر بووە.

سەردەمی پێگەیشتنی کەتا تەمەنی چلساڵی دەکات، لەسەردەمی حوکمڕانی ئەمەوییەکاندا بووە، ئەم تەمەنەش بەسە بۆ پێگەیشتنی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی، لەسەردەمی عەباسییەکانیشدا وانەی بەفێرخوازان دەوتەوە و لێی بەهرەمەند دەبوون، بیروڕای لەگەڵ زانایاندا ئاڵوگۆڕ دەکرد، سوودیان بەیەکتر دەگەیاند و بۆچوونی یەکتریان دەوڵەمەند دەکرد.

ڕاست نییە ئەگەر پێمان وابێت لەسەردەمی عەباسییەکاندا هیچ عیلمێکی وەرنەگرتووە و تەنها وانەی وتووەتەوە، چونکە عەقڵ هەمیشە خوازیاری مەعریفەیە، بەتایبەت عەقڵی زانایەکی دڵسۆزی وەك ئیمامی مالیك، لەبەر ئەوە تا گەیشتووتە تەمەنی پیری دەتوانین وایدابنێین کەعیلمی وەرگرتووە، هێندە هەیە ئەتوانین لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەندا کەمتری وەرگرتووە لەعیلم و زیاتری بەخشیووە.

وەك ئەوەی باسمان کرد، ئیمامی مالیك لەو دوو سەردەمەدا ژیاوە، پێویست دەکات بەکورتی و پوختی ئاماژەیەك بەژیانی سیاسی بکەین لەهەردوو سەردەمی ئەمەوی و عەباسیدا، پاشان باسی ژیانی کۆمەڵایەتی لەوڵاتانی ئیسلامیدا بەگشتی بکەین،

بەتایبەت لەشاری مەدینەدا، دواتریش ئامارە بەو بیرۆکە و بۆچوونانە بدەین کەلەسەردەمی ئەودا سەریان هەڵدا.

مالیك شاری مەدینەی بۆ نیشتەجێبوون هەڵبژاردبوو، بەهیچ شوێنێکی تر ڕازی نەدەبوو.

**لایەنی سیاسی ژیانی:**

سەرەتا لەلایەنی سیاسییەوە دەست پێدەکەین، مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەردەمی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك ژیاوە، لەم سەردەمەدا دەسەڵاتی ئەمەوییەکان جێگیر بوو، لەم سەردەمەدا زۆر ناوچە و وڵاتی تر ئیسلامیان پێگەیشت و موسڵمان بوون، بەهۆی ئەو سەقامگیرییەوە سەردەمی حوکمڕانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی دادپەروەری بەنی مەروان دەستی پێکرد، مالیك نیعمەتی سەقامیگیری بارودۆخ و بەرهەمەکەی بینییەوە، ئاگاداربووە لەو ڕووداوانەی لەنێوان ئیمامی عەلی و معاویەدا ڕوویداوە پێشتر. بەهەمان شێوە هی سەردەمی یەزید کەتێیدا پەلاماری شاری مەدینە دراوە و سوکایەتی بەپیرۆزییەکانی کراوە.

بەهەمان شێوە هەواڵی هەبوو لەئاشووبی نێوان زوبەیر و عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، هەواڵی لەبارەی پەیدابوونی خەواریجیشەوە هەبووە، ئیمامی مالیك سروشتێکی هێمنانەی

هەبووە، وای سەیرکردووە دروستکردنی کێشەو نائارامی و ململانێ بەرهەمی نابێت، هەربۆیە هەندێك لەنووسەران ئەم هەڵوێستەیان وا لێك داوەتەوە کەپشتگیرییە بۆ دەسەڵاتی ئەمەوییەکان، یان پشتیوانیان بووە، لەڕاستیدا ئەو نە ڕازی بووە لێیان نە توڕە، بەڵکو دژی ئاشووب و جەنگ بووە، سەقامگیری بەهۆکاری گۆڕانکاری و بەرەو باشچوون زانیووە.

سەردەمی حوکمڕانی عەباسییەکان هات، پێش هاتنی ئاڵۆزی و ناڕەزایەتی لەزۆر شوێنی ناوچە ئیسلامییەکان بەرپا بوو، موسڵمانان کەوتبوونە ناو ئاشوب، خەواریج پەلاماری شاری مەدینەیاندا و زۆر لەنەوەی ئەنصار و موهاجیرەکانیان بەناحەق کوشت. گومانی تێدا نییە کەئیمامی مالیك بەوە ڕازی نەبووە، ترسی ئەوەشی هەبوو ڕەوشی وڵاتانی ئیسلامی بەتەواوەتی بشێوێت و سەقامگیری بەخۆیەوە نەبینێتەوە، بۆیە نیگەران بووە، نیگەرانیەکەی لەبەر ئەوە نەبووە بەنی ئومەییەی خۆش بووێت و ڕقی لەبەنی عەباس بێت، ڕازی بوونی مالیك پاش توڕەبوونەکەی بەهەمان شێوەی هەڵوێستی بوو کەبەرانبەر ئەمەوییەکان هەیبوو..

شێوازی وەرگرتنی حوکمڕانییانی بەوجۆرە بەشەرعی نەدەزانی وەك ئەوەی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان (ڕەزای خوایان لێ بێت) پێ هەڵبژارد، بەڵام بە دەسەڵاتدرێتی و حوکمڕانییەکەیان ڕازی بوو،

چونکە بەرێگری لەئاشووب و ئاژاوە دەبینی، خوای گەورەش قەومێك ناگۆڕێت تا خۆیان خۆیان نەگۆڕن.

بینی بەنی عەباس گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانی دەبن، ڕێنموونیەکانی وەردەگرن، ئەمەش هاندەر بوو بۆی هەتا پەیوەندی لەگەڵیان بەردەوام بێت و دیاریان لێ وەربگرێت، بەشوێن ئەوەوە نەبێت سەرچاوەکەی چییە: چونکە خەلیفەکانی عەباسی بەهۆی ئەو پەیوەندی نزیکایەتییەی لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەیان بوو، واسەیری خۆیانیان دەکرد کەئەو پێگە ئاینییەی کەهەیانە، لەسەریان پێویست دەکات پەیوەندییان لەگەڵ زانایاندا هەبێت، ئەو کردەوە و ڕەفتارانەشی دەیکەن بەشێوەیەکی شەرعی بێت، پێکەوە کۆکردنەوەیەکی گونجاویان کردبوو لەنێوان دونیاویستی و خۆشگوزەرانی لەگەڵ ئاییندارییدا.

**لایەنی کۆمەڵایەتی:**

سەبارەت بەبارودۆخ و ڕەوشی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەش مالیك ئاگاداری بووە و تێیدا ژیاوە.

لەڕووکارەکانی ژیانی ئەو ڕۆژگارەی شارە ئیسلامییەکان ئەوە بووە کەشارەکانی خەڵك و نەتەوەی هەمەچەشنیان تێدا بووە، سنووری حوکمڕانی ئیسلامی زۆر فراوان بووە، بەجۆرێك

لەڕۆژهەڵاتەوە گەیشتووەتە چین، لەڕۆژئاواوە گەیشتووەتە ئەندەلووس، هەر ناوچەیەکیش خەسڵەتی کۆمەڵایەتی و بازرگانی و زانستی تایبەت بەخۆی هەبووە، بەهۆی زۆری زانایانیانەوە ویستوویانە پێگەیەکی بەرزو دیاریان هەبێت.

ڕەوشی شارەکان بەوجۆرە بوو، خەڵکی هەمەچەشنی لەخۆ دەگرت، جۆرەها شارستانیەتی جیاواز بەیەکدا چووبوو، هەر کۆمەڵگایەکیش بەوجۆرە بێت دیارە ڕووداوی کۆمەڵایەتی زۆر تێیدا ڕوودەدات. هەر ڕووداوێکیش حوکمی شەرعی خۆی پێویستە، شەریعەتی ئیسلامیش گشتییە و حوکم دەدات بەڕێگەپێدان یان ڕێگەپێنەدان لەهەر ڕووداوێکدا، ئەم بارودۆخە بۆی هەیە ببێتە هۆی فراوانبوونی عەقڵییەتی شەرعزان، مێشکی زیاتر بکاتەوە بیخاتەکار بۆ بەدواداچوون و تێگەیشتن و هەڵێنجانی حوکمی ڕووداوە نوێیەکان.

لەکاتێکدا بارودۆخی شارە ئیسلامییەکان بەوجۆرە بوو، شارەکانی حیجاز، جێنیازی هەموو موسڵمانان بوو، هەتا ئێستاش بەهەمان شێوەیە، هەموو جۆرە خەڵکێکی تێدا دەبینیت، لەهەموو گۆشەیەکی سەرزەوییەوە خەڵك ڕووی تێدەکات، هەمە ڕەنگ، زمان جیاواز، بەمەش لەنزیکەوە خەڵکان جودا دەبینرێت نەك تەنها بەهەواڵ و باس و بەسەرهات.

شاری مەدینە کەشوێنگەی هیجرەت بوو، ڕەوزەی شەریفەو مزگەوتی پێغەمبەری(صلی الله علیه وسلم) لێ بوو، جێنیازی سەردانی موسڵمانان بوو لەهەموو شوێنێکەوە، ئومێدەواری مانەوەیان تێیدا هەبوو، تا لەپەنای پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) ئارام بگرن، کاتێ ئیمامی مالیك ئەو شارەی وەك شوێنی مانەوەی هەڵبژارد، هەموو جۆرە خەڵکێکی تێدا دەژیا، ئەویش هەموو ئەمانەی ڕۆژانە دەبینی و دەبیست.

ئەمە ئاماژەیەکی کورت و پوخت بوو بەڕەوش و بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەو دەوورو زەمانە.

## لایەنی عەقڵی:

لایەنی عەقڵی لەسەردەمی ئیمامی مالیکدا بۆ دوو لا دەگەڕایەوە:

یەکەمیان: ئەو بیرۆکە عەقڵیانەی کەلەو سەردەمەدا باو و بڵاو بوو.

دووەمیشیان: دیراساتی ئایینی تێیدا و پێگەی شاری مەدینە و شوێنی لەو دیراساتانەی کەپەیوەنددار بوو بەفیقهو زانستە ئایینیەکانەوە بەگشتی.

سەبارەت بەلایەنی یەکەم: پێویست دەکات ئاماژەیەکی کورت بەو بیروبۆچوونانە بکەین کە لە ئارادا بوون، چونکە سەردەمی

ئەمەوییەکان و سەرتای سەردەمی عەباسییەکانیش، وڵاتانی ئیسلامی بەگشتی و عێراق بەتایبەت شوێنی هاوردەی ئەو بیرۆکە و قوتابخانانە بوو کەبەشاراوەیی بیروباوەڕی موسڵمانانی دەشێواند، هەندێ بابەتیان دەوروژاند کەسەخت بوو عەقڵ بەئاسانی پەیبیان پێ ببات، وەك بابەتی قەزاو قەدەر، ئیرادەی مرۆڤ ئایا موخەیەرە یان موسەیەرە، ئەمانەو چەندین بابەتی دیکە هاتبووە ئارا.

لەڕاستیدا ئەم بابەتانە بەئەنقەست و بەمەبەست دەوروژێنرا، بۆ ئەوەی خەڵکی لەئایینەکەیان دوودڵ بکەن و دووریان بخەنەوە و ڕیزی موسڵمانان پەرتەوازەیی تێ بکەوێت، لەو کتێبانەی کەلەسەردەمی عەباسییەکاندا نووسراون ئاماژە بۆ ئەو دەستانە کراوە کەبەپەنهانی ئەو بابەتانەیان لەنێو موسڵماناندا وروژاندووە، جاحیز لەنامەکانیدا ئاماژەی بەو بابەتانە کردووە کە گاورەکان وروژاندوویانە کە لەڕێگەیەوە پاراستنی ئایینەکەی خۆیان تێدا بینیوە.

لەمێژووی موسڵماناندا دەبینرێت کەهەندێك گاور نزیك لەدەسەڵاتداران هەبوون، وەك یوحەننای دیمەشقی، کەلەخزمەتی ئەمەوییەکاندا تا سەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك کاری کردووە. دەوترێت ئەم پیاوە هەستاوە گاورەکانی فێری ئەو شتانە

کردووه کەمشتومڕی لەگەڵ موسڵمانەکاندا پێ بکەن لەبارەی ئایینەکەیانەوە.

لەپەرتووکە کەلەپوورییە ئیسلامییەکانیشدا هاتووە: "ئەگەر عەرەبێك پرسیاری لێ کردیت، لەبارەی مەسیحەوە چی دەڵێیت؟ پێی بڵێ ئەو کەلیمەی خوای گەورە بوو(كلمة الله).

پاشان گاورەکە با پرسیار لەموسڵمانەکە بکات قورئان مەسیحی چۆن ناوبردووە؟ ئەم هیچ نەڵێت تا موسڵمانەکە وەڵام ئەداتەوە، موسڵمانەکە ناچارە بڵێت مەسیح عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەری خوایە و ئەو کەلیمەیەتی کەناردوویەتی بۆ مەریەم و ڕۆحی ئەوە.

ئەگەر موسڵمانەکە بەوجۆرە وەڵامی دایەوە پرسیاری لێ بکە سەبارەت بەکەلیمەو ڕۆحی خودا، مەخلوقە واتە دروستکراوە یان مەخلوق نییە، ئەگەر وتی مەخلوقە، ئەوا بەوە وەڵامی بدەرەوە خودا هەبووە و نەکەلیمە نە ڕۆحی نەبووە پێشتر، ئەگەر ئەمەی وت ئەوا دەبێتە زەندیق بەبۆچوونی موسڵمانەکان".

وروژاندنی ئەم پرسیارە ئەگەرچی هیچ حەقیقەتێکی لەخۆ نەگرتووە، ڕاکیشانی کەسەکان بووە بۆ کۆنیەتی کەلامی خوا، دەبێت بزانین کەلیمە درانە پاڵ خودا و ئەوەی کە ڕۆح لەخودا بێت بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە ئەوان کۆنتر بن، چونکە ئەو کەلیمەیەی خوای گەورە دروستی دەکات کۆن نییە، ڕۆحیش بەهەمان شێوە،

عیساشی بەکەلیمەی خوا ناوزەد کردووە، چونکە بەتەنها کەلیمەیەکی خوای گەورە: (کن) دروست بووە، بەبێ ناوەندگیری باوك (اب)، ڕۆحیش بەهەمان شێوە، چونکە کەرەستەی یەکەمی زیندوو بوون بەپێی سوننەتی گشتی کەخوای گەورە لەئادەمیزاددا کردوویەتی بریتی نییە لەشێوەی دۆزینەوەی، مرۆڤەکانیش بەدیارترین بارودۆخیان وەسف دەکرێن.

پاشان فێریان دەکردن ڕەخنە لەبنەماکانی ئیسلام بگرن، باسی فرە ژنییان دەکرد، لەبارەی تەڵاقەوە دەدوان، هەندێ درۆ و دەلەسەیان لەبارەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەوروژاند و بڵاو دەکردەوە، وەك سەربردەی عاشقبوونی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لێ بێت) بۆ زەینەبی کچی جەحش، کەهاوسەری زەید بووە، شتی تری لەمجۆرانە.. پاشان باسی ئەوەیان دەکرد کەپیرۆزکردنی حەجەرولئەسوەد بەهەمان شێوەی پیرۆزکردنی خاچە.

تەنها بەوەندەش وازیان نەدەهێنا، بەڵکو مشتومڕکارانیان پاڵ پێوە دەنا بۆ ڕاکێشانی موسڵمانان بۆ ناو بابەتی قەزا و قەدەر، ئیرادەی مرۆڤ و ئازادی ئیرادە و نەبوونی ئازادی تێیدا.

بەمجۆرە ناکۆکییان لەنێوان موسڵماناندا دروست دەکرد و یەکڕیزیانیان دەشێواند، زۆرێك لەم کارانە لەلایەن کەسێکەوە دەکرا

کەلەنێو بنەماڵەی ئەمەویدا حەوێنرابوویەوە و پێشتریش باوکی حەوێنرابوویەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا، جوڵانەوەیەکی تر هەبوو، سەرەتاکەی بۆ سەردەمی ئەمەوییەکان دەگەڕایەوە، لەسەردەمی عەباسییەکاندا گەشەی کرد و گەیشتە بەرهەم، ئەویش جوڵانەوەی پەیوەنددار بەفەلسەفەی یۆنانی بوو، ئەم جوڵانەوەیە لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا دەستی پێکرد، ئیبن خەلەکان لەمبارەیەوە دەڵێت: "خالیدی کوڕی معاویە لەشارەزاترین کەسەکانی قورەیش بوو لەهونەرەکانی عیلمدا، قسەی هەیە سەبارەت بەکیمیا و پزیشکیی، بەرچاوڕوون بووە لەم دوو زانستەدا، لەمبارەیەشەوە نووسینی هەیە بەڵگەیە لەسەر شارەزایەتییەکەی، ئەم شارەزاییەشی لەڕاهیبێکەوە وەرگرتووە کەناوی (بریانسی ڕۆمی) بووە، لەمبارەیەوە سێ نامەی هەیە، لەیەکێکیاندا باسی ئەوە دەکات کەلەنێوانی ئەو لەگەڵ بریانسی ڕۆمیدا ڕوویداوە، لەگەڵ چۆنیەتی فێربوونی لێیەوە، ئەو هێمایانەی کەئاماژەی پێداون".

ئەم پەیوەندییە فیکرییە بەفەلسەفەی یۆنانییەوە جوڵانەوەی وەرگێرانی گەشەپێدا، بەهۆیەوە فیکری یۆنانی و فارسی و هندی لەسەردەمی عەباسییەکاندا دەرکەوتن، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر فیکری ئیسلامی، کاریگەریەکەش جیاواز و جۆراو جۆر بوو،

بەپێی هێزی عەقڵ و ئایینداری ئەو کەسەی فەلسەفەکە شارەزا دەبوو. خەڵك هەبوو خاوەن عەقڵێکی هۆشمەندی دامەزراو و ئیمانێکی پتەو بوو، ئەمانە بەهێزی عەقڵیان و هێزی ئیمانەکەیان زاڵدەبوون بەسەر ئەو بیرۆکانەدا کە وەریان دەگرت و بەچاکی هەزمیان دەکرد و، سوودیان لێ دەبینی. هەشیانبوو توانای بەرگەگرتنی ئەوەیان نەبوو، عەقڵیان تووشی ڕاڕای دەبوو، دەکەوتنە ئاڵۆزییەکی فیکری و بێ سەرو بەرەییەوە.

ئیمامی مالیك لەم سەردەمەدا ژیاوە، بێگومان ئەو بیروبۆچوونە دژ بەیەکانەی بەرگوێ کەوتووە، بەڵام قسەی لەبارەیانەوە نەکردووە، ڕێگەی بەکەس نەداوە مشتومڕ لەبارەیانەوە بکات، چونکە بۆ زانا نییە هەموو ئەوەی دەیزانێت باسی بکات، بەڵکو ئەوەی بەسوودە و گوێگرەکان گوێڕایەڵی دەبن و گونجاوە بۆیان بیخاتە ڕوو.

بەڵێ بەو ڕادەیەی کە ئەبوحەنیفە شارەزایی تێیدا هەبووە ئەم شارەزای نەبووە، چونکە ئەبوحەنیفە هاوسەردەمی بووە و، عێراقیش مەڵبەندی تەشەنەکردنی بووە لەو سەردەمەدا. لەکاتێکدا ئیمامی مالیك لەمەدینە بووە و، دوورتر بووە و ئەو کاریگەرییەی لەعێراقدا هەیبووە لەوێ نەیبووە، ئەوەی لەو سەردەمەدا لەبەسرە و کوفە ڕەواجی پێدراوە، لەشاری مەدینە ویستی لەسەر نەبووە،

لەمەدینە باوی زانستی قورئان و سوننە و دەرهێنانی حوکمی فیقهی بووە لەسایەیاندا.

ئەوە ململانێ فیکرییەکانی سەردەمی مالیك بووە، ئاگادار بووە لێیان، کاریگەری خراپیان هەبووە لەسەری، زۆری لەبارەوە زانیوون، خۆی لێ دوور گرتوون، وەك کەسێك کەخراپە بناسێت خۆی لێ دوور بگرێت، نەك وەك کەسێك کەچاکە ئاشنا بێت و شوێنی بکەوێت.

## زانستە ئایینیەکان لەسەردەمی مالیکدا:

زانست لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا بەرەو ئەوە دەڕۆیشت کەتەنها بەبیستن وەربگیرێت، لەکتێبدا نەدەنووسرایەوە، کاتێ خەڵکانێکی زۆر ڕوویانکردە خوێندنی زانستە هەمەجۆرەکان، ئیدی زانایان لەکۆتاییەکانی سەردەمی ئەمەوییەکاندا ڕوویانکردە نووسینەوەی عیلمەکان، وایلێهات هەر عیلمێك عالمی تایبەت بەخۆی هەبێت کەپسپۆڕە تێیدا. لەبەر ئەوە زانایان و شەرعزانان و فەرموودەناسان لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا دەستیان کرد بەنووسینەوەی فیقهو فەرموودە.

شەرعزانانی حیجاز، فەتواکانی عبدالله کوڕی عومەر و عائیشە و ئیبن عەباس و ئەو تابعینانەی لەدوای ئەوان لەشاری مەدینە هاتن کۆ دەکردەوە، پێداچوونەوەیان بۆ دەکردن، لەوانەوە حوکمیان

دەردەهێناو لقیان لێ دەبوویەوە. لەعێراقیش شەرعزانان فەتواکانی عبدالله کوڕی مەسعودیان کۆ دەکردەوە، لەگەڵ بابەتەکانی عەلی و فەتواکانی و، بابەتەکانی دادگایی شورەیحی قازی لەدادگای کوفە، لەمانەوە حوکمیان دەردەهێنا، کاتێ سەردەمی عەباسییەکان هات ئاسۆکانی نووسینەوەی فەرموودە فراوانتر بوو، بەشێوەیەکی ڕێککراو بەشێوازی فیقهی دەیانخوێند.

شیعەکانیش بەهەمان شێوە بۆچوونەکانی خۆیان دەنووسیەوە، هەندێك شوێنەوار لەمیلانۆ دۆزراوەتەوە، لەنێویاندا دەستنووسێك هەیە دەدرێتە پاڵ ئیمامی زەید کەلەساڵی ١٢٢ی کۆچیدا شەهید بووە، کەشەرعزان بووەو کتێبی (المجموع المطبوع) دەدرێتە پاڵ ئەم ئیمامە، ئیتر ڕاست بێت یان نا، بەدڵنیاییەوە شیعەی زەیدی لەسەردەمی ئیمامی مالیکدا بۆچوونی فیقهی دیاریان هەبووە، ئیمامی مالیکیش پەیوەندی هەبووە لەگەڵ ئیمام جەعفەری صادق و فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە.

ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ئەو سەردەمە سەردەمی مونازەرە بووە، مونازەری توند لەنێوان دەستەو فیرەقە جیاوازەکاندا ئەنجام دەدرا، لەنێوان شیعەو سوننە، خەواریج، زۆر گروپ و دەستەی تر، زاناو شەرعزانان لەناوچەیەکەوە دەچوون بۆ ناوچە و شارێکی تر

بەمەبەستی مونازەرە، هەندێ لەزانایانی بەسرە دەچوون بۆ کوفە بەمەبەستی ئەنجامدانی مونازەرە لەگەڵ زانایانیاندا.

مونازەرە فیقهیەکانیش بەزۆری لەوەرزی حەجدا بوو، دەبینین ئەبوحەنیفە تاوتوێی بابەتە فیقهیەکان لەگەڵ مالیکدا دەکات، یان لەگەڵ ئەوزاعی، ئەو مونازەرە فیقهییانە بەپیت و بەرهەمدار تر بوو لەمونازەراتەکانی تر.

ئیمامی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) لەو مشتومڕانە خۆی دوور دەگرت کەمەبەست لێیان پێشبڕکێ و بردنەوە بوو، لەبەر ئەوە وەڵامی بۆ خەلیفە هاروونە ڕەشید ئەوە بوو کاتێ داوای مونازەرەی لەگەڵ یوسف لێ کرد: "عیلم وەك شەڕە کەڵەشێر نییە، بۆ بردنەوە بێت، بۆچوونی وابوو مشتومڕ لەئاییندا هیچ بەرهەمێکی نابێت".

زۆرجار هەبووە لەگەڵ زانایانێکی دڵسۆزدا مونازەرەی کردووە، ئەوەتا لەگەڵ ئەبوحەنیفەدا مونازەرەی کردووە، بەلەیسی دەوت فەقیهی میسر، لەگەڵ ئەبو جەعفەری مەنسوڕدا مونازەرەی کردووە، نامەشی ناردووە بۆ ئەوانەی بۆچوونەکانیان پێچەوانەی ئەم بووە.

لەسەردەمی ئیمامی مالیکدا گرنگیدان بەزانستەکان بەپێی شارەکان جیاوازی هەبوو، هەر شار و ناوچەیەك زیاتر بەجۆرێك عیلم ناسرابوو کەجێی بایەخیان بوو، بۆ نموونە شاری بەسرە لەزانستە ئایینییەکاندا گرنگیان بەو بابەتانە دەدا کەپەیوەندار بوو

بەعەقیدەوە، بەمەش ناسرا بوو، چەندین فیرەق و دەستەی جیاوازی تێدا بوو کەسەبارەت بەفەلسەفەی عەقیدە قسەیان دەکرد، زانایانی وەعز و سەربوردەشی تێدا بوو وەك حەسەنی بەسری، زۆر بەکەمی فیقهی تێدا بوو.

شاری کوفەش فیقهی عێراقی تێدا بوو کە پشتی بەوە بەستبوو لەئیبن مەسعود مابوویەوە، لەگەڵ بۆچوونەکانی ئیبراهیمی نەخەعی و قوتابخانەکەی، کەخۆی لەوانەکانی حەمادی کوڕی ئەبو سلێماندا دەنواند، پاش ئەویش ئەبوحەنیفە وانەی وتەوە، فیقهی تەقدیری تێدا بوو، لەگەڵ فیقهی قیاس و ئیستیحسان بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا.

شاری دیمەشق فیقهێکی تێدا بوو کەلەسەر شوێنەواری هاوەڵان و تابیعین بوو، لەگەڵ کەمێك بیروڕا، ئەمەش خۆی لەفیقهی ئەوزاعی و قوتابخانەکەیدا دەنواند. ئەوزاعی عالیم و ئاگادار بوو لەعیلمی سوننە، بەڵام وەك ئیمامی مالیك فەرموودەناس نەبوو.

شاری مەدینە جیاواز بوو، فەرموودەی تێدا بوو، شوێنەواری سەلەفی صالحی تێدا بوو، بیروبۆچوونی ئەو هاوەڵانەشی تێدا بوو کەبەخاوەن بۆچوون ناسرابوون، وەك عومەر (خوا لێی ڕازی بێت)، زەیدی کوڕی سابت، لەگەڵ ئەوانەی لەزانستەکەی بەهرەمەند بوون، هەروەها فەرموودە و سوننە و بۆچوونیشی تێدا بوو.

لەم شارەدا حوکمی خوای گەورە بناغەی حوکمڕانی بوو، زۆرێك لەئایەتەکانی قورئان لەم شارەدا هاتوونەتە خوار بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لەم شارەدا پێغەمبەر شەریعەتی خوای پەیڕەو کردووە، واتە ئەزموونی کرداریی حوکمڕانی بەشەریعەتی خودای تێدا بووە، پاش پێغەمبەریش هاوەڵە بەڕێزەکان بەشی هەر زۆریان لێرە بوون، پایتەختی حوکمڕانی ئیسلامی بووە، لەم شارەدا حومی بابەتە نوێیەکان دەرهێنراوە، لەبەر ئەم هۆکارانە و چەندین هۆکاری دیکە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) گەورە هاوەڵانی شەرعزانی لەلای خۆی هێشتبوویەوە و پرس و ڕاوێژی پێدەکردن، ئەنجومەنێکی شورای لێ پێکهێنابوون.

کاتێ عومەری فاروق شەهید کراو خەلافەت گوێزرایەوە بۆ عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت)، ڕێگەیدا بەو هاوەڵانەی کە عومەری لای خۆی هێشتبوونییەوە بۆ پرس و ڕاوێژ کەبچن بۆ وڵات و ناوچەکانی تر، ئەوانە نورر و ڕۆشنایی عیلم و مەعریفە بوون، لەسەردەمی ئیمامی عەلیشدا بەهەمان شێوە ڕێگەی دەرچوون لەمەدینە و نیشتەجێبوون لەوڵاتانی ترِیان هەبوو، تەنانەت خۆیشی شاری مەدینەی بەجێ هێشت و لەشاری کوفە نیشتەجێ بوو.

کاتێ ئەمەوییەکان حوکمڕانییان گرتە دەست، زۆرێك لەهاوەڵان هاتنەوە بۆ شاری مەدینە، تا دوور بن لەفەرمانڕەوا و دەستەڵاتدارن، نەوەك نزیکی ئەمانە بەو مانایە نەبێت کەلەهەموو کارێکی ئەو حوکمڕانانە ڕازین.

کاتێ سەردەمی حوکمڕانی یەزید هات، دواتریش بەنی مەروان و ئاشووب زیاتر بوو، زۆرترین زانایانی تابعین دەگەڕانەوە بۆ شاری مەدینەو پەنای حەرەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و شوێنەواری پێغەمبەر و هاوەڵانی پایەبەرز، خۆیان یەکلا کردەوە بۆ دیراساتی ئایینی و ڕوونکردنەوەی کاروباری ئایینی خەڵکی سەبارەت بەڕووداوە نوێیەکان، تا سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هات، کاتێ ویستی خەڵکی لەئایینەکەیان باشتر ئاگادار بن، هیچ شوێنێکی تری نەبوو پەنا بۆ زانایانیان ببات. شاری مەدینە نەبێت، تا لە زانایانی پێگەیشتوو و تێگەیشتوویان سوود وەربگرێت.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەستا بەناردنی ئەو زانایانە بۆ شوێن و ناوچە جیاوازەکانی ژێر حوکمڕانی ئیسلام، تا خەڵکی لەکاروباری ئایینەکەیان بەباشی ئاگادار بن، لەوانەی خۆشەویستی خەڵکی بۆ ئەو زانایانەی لەشاری مەدینەوە ڕۆشتبوون، وای کردبێت خەڵکی باکووری ئەفریقیا شوێنکەوتەی مەزهەبی ئیمامی مالیك بن، چونکە

ئیمامی مالیك بەدرێژایی تەمەنی لەشاری مەدینە ژیاوە و هەرگیز نەچووەتە باشووری ئەفریقیا.

ڕاست نییە بڵێین کە فیقهو سووننە بەتەنها لەشاری مەدینەدا هەبووە، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەهەموو شوێن و ناوچەکاندا بڵاو بووبوونەوە، بووبوونە سەرچاوەی عیلم و عیرفان و تێگەیشتنی جوان لەئایینی ئیسلام، جگە لەهاوەڵان تابعییەکانیش بەهەمان شێوە بەناوچە جیاوازەکاندا بڵاو بووبوونەوە و خزمەتی شەریعەتی ئیسلامیان دەکرد.

## فەرموودە و ڕەئی

لەپاش وەفاتی پێغەمبەری ئازیز (صلى الله عليه وسلم)، هەروەك شەهرستانی لە کتێبی (الملل والنحل)دا باسی کردووە: "ڕووداو و کارەساتەکان لەبواری عیبادەت و هەڵسوکەوتدا بێ ئەژمار زیادی کرد، گومانی تێدا نییە سەبارەت بەهەر ڕووداوێکی دیاریکراویش دەق نەهاتووە بەتایبەت، کەسیش وا گومان نابات کەدەق لەبارەی هەموو ڕووداوێکەوە هەبێت، دەقەکان کۆتاییان بۆ هەیە، بەڵام ڕووداوەکان بێکۆتایین، ئەوەشی بێ کۆتایی بێت بەشتی کۆتایی بوو چارەسەر نابێت، لێرەوە بەپێویست زانراوە کە ئیجتیهاد و قیاس هەبێت، هەتا لەبارەی هەر ڕووداوێکەوە ئیجتیهاد هەبێت."

لەبەر ئەوە هاوەڵان لەپاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبەردەم ڕووداوی زۆر و بێ ئەژماردا بوون، قورئانی پیرۆزیان لەبەر دەستدا بوو لەگەڵ سوننەتەکانی پێغەمبەر و ئەو داوەرییانەی لەژیانیدا کردبووی، پەنایان بۆ قورئانی پیرۆز دەبرد بۆ دۆزینەوەی حوکمی ئەو بابەتەی خرابوویە بەردەمیان، ئەگەر حوکمێکی ڕوونی تێدا بووایە سەبارەت بەڕووداوەکە ئەوا بەوە حوکمیان دەکرد، خۆ ئەگەر تێیدا نەبووایە ئەوا پەنایان بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر دەبرد، بەگوێرەی ئەوەی لەیادی هاوەڵاندا هەبوو لەفەرموودە و بەسەرهاتەکان، تا بەوجۆرە لەبارەی ڕووداوەکەوە حوکمێکیان دەربهێنایە.

ئەگەر لەوێشدا دەستیان نەکەوتایە، ئەوا بەهەمان شێوەی دادوەر کەپابەندە بەدەقەوە، – ئەگەر دەستی نەکەوت ئەوا دەقێك سەبارەت بەڕووداوێك کەنزیك یان هاوشێوەی ئەم بێت، یان ئەوەی بەدادپەروەرانە و بەویژدانانەی ببینێت–، بەوجۆرە حوکمیان دەکرد، کاریان بەڕەئی دەکرد، ئەگەر لەقورئان و فەرموودەدا دەق لەبارەی ڕووداوەکەوە نەبووایە.

بەمجۆرە هاوەڵان کاریان بەڕەئی کردووە، بەڵام بۆچونیان یەك نەبووە سەبارەت بە بڕی کارکردن بەڕەئی، دەستەیەك زۆر کاریان پێ کردووە، دەستەیەکیش کەم، بەڵام ئەوە زاڵ بووە ئەوکاتەی

دەق لەبارەی ڕووداوەکەوە نەهاتبێت ئەوا کار بەڕەئی کراوە، هەموویان کۆدەنگ بوون لەسەر کارکردن بەقورئان و فەرموودە ئەگەر دەقیان لەبارەیەوە تێدا بوو، ئەگەر نەبوو ئەوا شەرعزانە بەناوبانگەکان پەنایان بۆ ڕەئی دەبرد.

لەنێو هاوەڵانیشدا هەریەك لەعومەری کوڕی خەتاب و زەیدی کوڕی سابت و عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و عبدالله کوڕی مەسعود و چەند هاوەڵێکی دیکە بەخاوەن ڕەئی ناسرابوون.

لەسەردەمی تابعیندا ئەو دوو دەستەیەی ئاماژەمان پێدا کەلایەکیان زیاتر کاری بەڕەئی دەکرد و لایەکی تر کاری بەفەرموودە زیاتر دەکرد، زیاتر لێك دوور کەوتنەوە، هەر لایەکیان زیاتر دەستیان گرتبوو بەمەنهەجەکەی خۆیانەوە، هەر لایە پێی وابوو بەوجۆرەی ئەو کارە دەکات زیاتر خزمەتی ئایینەکەی دەکات، لەبەر ئەوە دوو جۆر لەفیقهـ دەرکەوت، فیقهی ڕەئی و فیقهی ئەسەر، لەهەردوولاش شەرعزانی گەورە دەرکەوتن.

بنچینەی ئەم ڕاجیاییەی نێوان ئەم دوو دەستەیە لەبەڵگەهێنانەوە بەفەرموودە نەبوو، یان لەقبوڵکردنی ڕاستبوون و پێویستی کارکردن پێیەوە ئەگەر سەلمێنرا، بەڵکو بناغەی ناکۆك بوونەکە لەفەتوادان بەڕەئی بوو، هەروەها لەچوونە سەر بابەتە لاوەکییەکان (فەرعییەکان)بوو ، لقیان لێدەبوویەوە بابەتەکانیان،

ئەوانەی ئەهلی ئەسەر بوون تەنها لەسەر ئەو بابەتانە فەتوایان دەدا کەڕوویاندەدا، بەناچاری نەبووایە پەنایان بۆ ڕەئی نەدەبرد، ئەو ناچارییەی کە موسڵمان پەنا بۆ خواردنی گۆشتی بەراز دەبات، لقیشیان لەبابەتەکان نەدەکردەوە، تەنها حوکمیان بۆ ئەو کاروبارانە دەردەهێنا کەڕوویاندابوو، بەڵام ئەهلی ڕەئی زۆر فەتوایان سەبارەت بەبابەتەکان دەدا، ئەگەر فەرموودە نەبووایە لەبارەی ئەو بابەتەوە کەئیجتیهادیان تێدا دەکرد.

هەندێکیان تەنها بەدەرهێنانی حوکمی ئەو ڕووداوانە وازی نەدەهێنا کەڕوویداوە، بەڵکو گریمانەیان بۆ ئەو بابەتانەش دەکرد کەهێشتا ڕوویان نەدابوو، حوکمیان بۆ دەردەهێنا، وا بووە لەسەر زمانی زانایان کە زۆرترین ئەهلی حەدیس لەحیجاز بوون، زۆرترینی ئەهلی ڕەئیش لەعێراق بوون، ئەمەش بناغەیەکی هەیە، ئەویش بریتییە لەوەی شەرعزانانی مەدینە دەیانوت شەرعزانانی عێراق لەفەرموودە دوور کەوتوونەتەوە، بەڕەئی خۆیان فەتوا سەبارەت بەبابەتە ئایینییەکان دەردەکەن، شەرعزانانی عێراقیش ئەوەیان ڕەت دەکردەوە.

لەڕاستیدا ناتوانین بڵێین کەشەرعزانانی عێراق هەموویان ئەهلی ڕەئی بوون، بەڵکو زۆربەیان ئەهلی ڕەئی بوون، بەهەمان شێوە

ناشتوانین کەبڵێین شەرعزانانی حیجاز هەموویان ئەهلی ئەسەر بوون، بەڵکو زۆربەیان ئەهلی ئەسەر بوون.

لەسەردەمی ئیمامی مالیکدا مەدرەسە فیقهیەکان دەستیان بەدەرکەوتن کردبوو، بیروبۆچوون لەنێوانیاندا ئاڵوگۆڕ دەکرا، شەرعزانانی هەموو وڵاتان لەمەوسیمی حەجدا کۆدەبوونەوەو بیرورِا و زانیارییان ئاڵوگۆڕ دەکرد، ئەبوحەنیفە لەگەڵ مالیك کۆ دەبوویەوە، ئاڵوگۆڕی بۆچوونیان دەکرد، هەریەکەیان بەبابەخەوە سەیری بۆچوونی بەرانبەرەکەی دەکرد، بەهەمان شێوە لەنێوان لەیسی کوڕی سەعد و مالیکی کوڕی ئەنەس کە بە نامە و پەیام گۆڕینەوە ئاڵوگۆڕی بیرورِا کراوە.

## جیاڕایی ئەهلی ئەسەر و ئەهلی ڕەئی

جیاڕایی ئەهلی ئەسەر و ئەهلی ڕەئی لەمەنهەجدا نەبوو، هەردوولایان یەکدەنگ بوون لەکارکردن بەقورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەر لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەڵگە نەبوو سەبارەت بەبابەتەکە، ئەوا بەڵگەیان بە وتەی هاوەڵان دەهێنایەوە.

بەڵام جیاڕایی ئەم دوو دەستەیە لەسێ لایەنەوە بوو:

یەکەمیان: ئەوانەی مەدینە دادوەرییەکانی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و فەتواکانیان و فەتوای ئیبن عەباس و عائیشە و فەرموودەکانی ئەبوهورەیرەیان هەبوو، عێراقییەکانیش فەرموودەکانی ئیبن مەسعود و فەتواکانی و فەرموودەکانی ئیمامی عەلی و داوەری و فەتواکانیان هەبوو لەگەڵ داوەرییەکانی ئەبو موسای ئەشعەری و قازی شورەیح، جیاوازیی لەم لایەنەوە جیاوازیی مەنهەج نەبوو، بەڵکو جیاوازی ئەوکەسە بوو کەلێیەوە بۆچوونەکانیان سەرچاوەی گرتبوو.

دووەمیان: ئەو سەرمایە زۆرەی ئەسەر کەلای مەدینەییەکان هەبوو زۆر زیاتر بوو، لەوکاتەشدا پشت بەستن بەئەسەر زۆرتر بوو، بابەتە فیقهیەکانی ئەسەریش بریتی بوو لەداوەری و فەتواکانی هاوەڵان و ئەو بۆچوونانەی لەو ئەسەرانەوە سەرچاوەیان گرتبوو، یان حوکمەکانیان لەوانەوە وەرگیرابوو.

سێیەمیان: تابعییەکان فەتواکانیان پێگەیەکی تایبەتی هەبوو لای موجتەهیدەکانی مەدینە، ڕێزی تایبەتیان بۆ فەتواکانیان دادەنا، لەزۆربەی بابەتەکانیشدا کاریان پێدەکرد، بەڵام بۆچوونی تابیعییەکان پابەندکار نەبوو لای شەرعزانانی عێراق، دەگێڕنەوە کەئەبوحەنیفە خۆی بەڕەئی هاوەڵانەوە دەبەستەوە و لێی دەرنەدەچوو، بەڵام خۆی بەبۆچوونی تابیعییەکانەوە نەدەبەستەوە، ئەوان پیاوانێك بوون و ئیجتیهادیان کرد، ئەمیش بۆی هەیە ئیجتیهاد بکات.

**وەفاتی ئیمامی مالیك:**

ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خـوای لێبێـت)، سـاڵی (١٨٥)ـی کۆچـی، دوای تەمەنێکی درێژ لە ٩٢ ساڵیدا کۆچی دوایکـرد، بەڕاسـتی ژیـانێکی شـکۆمەند و جوامێرانـەی هـەبووە، شـایانی پەنـدوەرگرتن و مامەڵـەی نایابە، کەسێتیەکی هەبووە کەشخەیی و هەیبەت و ئەخلاقی تیا کۆبـوو بوویـەوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا سەرچـاوەی زانسـت بـووە، بینیمـان مامۆستایەکی گەورە بووە بۆ زانا گـەورەکان، بینیمـان چۆن مامەڵـەی کردووە لەگەڵ خەڵکی گشتی و تایبەت، دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات..

هەروەها بینیمان تێگەیشتووی لـە شـەرع و لێبـوردەیی بـۆ خـەڵك و وردی لە فتـوادا، ئـەو ئیمـامێکی نمونـەیی بەهەیبـەت و ڕێـزداو بـوو لـە مامەڵە و چۆنیتی فێرکردنی قوتابیەکانی لە کۆڕەکاندا..

دوای خـۆی یـەکێك لـە گـەورەترین مەزهەبـە ئیسـلامیەکانی بـۆ جێهێشتین، لەگەڵ قوتابیـەکی مـەزن کـە مامۆسـتا شـانازی بەبونیـەوە دەکات، ئەویش ئیمامی شافیعیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت).

***